## لەم ژمارەیەدا

# نووسەری کورد



ـ ئەو نووسینانەی دەگاتە گۆڤار نادرێتەوە خاوەنەکەی جا گەر بڵاوبووەوە یان نەبووەوە.
ـ نووسینە کان زادەی بیرکردنەودی خاوەنەکانیانن.
ـ دانانی نووسنیەکان بەپێی پێویستی هونەرییە.

ناونیشان: بەغدا گۆرەپانی ئەندەلوس یەکێتی گشتیی ئەدیب و نوسەرانی عێراق گۆڤاری «نووسەری کورد»

دەرهێنانی هونەری: هیوا محمد علی

وورته‌ی ژماره

## خوێنه‌ری ئازیز

● هیچ پێویست به‌وه ناکات مه‌سه‌له‌ی دواکه‌وتنی ـ نووسه‌ر ـ به هه‌ندێ قسه‌و هۆو به‌ڵگه پینه‌وپه‌رو بکه‌ین، ئێمه‌ش له گه‌ڵتانین که نه‌ئه‌بوو به‌م جۆره دوابکه‌وێ، داوای لێبوردن ئه‌که‌ین‌و به‌ڵێنی ئه‌وه‌تان ئه‌ده‌ینێ تۆڵه‌ی ئه‌م ماوه‌یه بکه‌ینه‌وه‌و به که‌مترین کات ژماره‌ی ئاینده‌تان پێشکه‌ش بکه‌ین، بۆیه تکامان وایه لێمان ببورن.

● نووسه‌ری کورد ـ گۆڤاری هه‌مووانه، گۆڤاری ئه‌و ئه‌دیب‌و نووسه‌رانه‌یه که هه‌میشه خزمه‌تی وشه‌ی کوردی ره‌سه‌ن ئه‌که‌ن‌و هه‌وڵی ئه‌وه ئه‌ده‌ن که ئه‌ده‌ب‌و رۆشنبیری کوردی پایه به‌رز بێت‌و له‌م عێراقه خۆشه‌ویسته‌مان‌دا بێش‌بکه‌وێ‌و په‌ره‌بستێنێ؛

● نووسه‌ری کورد باوه‌شی بۆ هه‌موو به‌رهه‌مێکی باش‌و به‌نرخ‌ئه‌کاته‌وه‌و هه‌رگیزاو هه‌رگیز دژ به‌هیچ رێبازێکی ئه‌ده‌بی نه‌وه‌ستاوه‌و ناوه‌ستێ‌و به هه‌میشه‌یی له‌گه‌ڵ سه‌ربه‌ستی بیروراد‌ابووه‌و لایه‌نی کۆمه ڵێکی نه‌گرتووه دژ به کۆمه‌ڵێکی تر، به‌ڵام ئه‌وه‌ی، پێویسته لێزدا بوترێ ئه‌وه‌یه که ئه‌م گۆڤاره به هیچ شێوه‌یه‌ك رێگه به‌وه نادات که ئه‌ده‌بی کوردی پیرۆز بشێوێنرێت له

رابوردوه دێرین‌و به‌نرخ‌و پایه به‌رزه‌که‌ی بپچرێت، به‌ڵکو بڕوای وابووه‌وه که مانه‌وه‌ی ئه‌ده‌بی راست‌و راسته‌قینه به که‌له‌پوورو سامانه نه‌ته‌وایه‌تی‌یه‌که‌تی.

• یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کوردیش هەرچەندە لەبەر مەسەلەی دارایی نەیتوانیوە وەک جاران بجوڵێتەوە بەڵام توانیویەتی هەندێ کۆڕو میهرەجانی ئەوتۆ سازبکات و لە میهرەجانی مەریەدی هەشتەم بەشداری بکات، ئاواتەخوازی ئەوەشین کە بتوانین لەم سەفەدا سێ یەم دیداری چیرۆکی کوردی سازبکەین لە گەڵ هەندێ جموجۆڵی تر.

چەند چالاکییەکی گەورەی ئەدەبی سازبکەین کە لە رادەی لێپرسینەوەی یەکێتییەکەماندا بێت و، بێگومانیشین کە ئەم ئەرکانە بەبێ پشتگیری گشت ئەدیبان نابێت بەدی نایەت و، بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی ئەمساڵان ساڵی رۆشنبیری کوردییەو، گشت هەوڵێکیشمان بۆ ئەوەیە ئەمساڵمان لە ساڵانی پێشوو بەپێت و، بەبەرهەمی پێشکەوتووتر بێت.

دەستەی نووسەران

محەمەد ئەمین هەورامانی

پێشەکی وای بەباش دەزانم ، کە نەخشەی[٢] چوارچێوەی باسەکەم بخەمە بەرچاوی خوێنەری بەرێز ، ئەویش بەم جۆرەیە : یەکەم . هەواڵی لەیلیٚ‌وهەجنوون ، لەناو ئەدەبی کۆنی[٣] عەرەب‌داو هۆی گوێزانەوەی !

دووەم : هەواڵی لەیلیٚ‌ومەجنوون ، لەناو ئەدەبی فارس‌داو هۆی گوێزانەوەی[٤]

سێیەم : هەواڵی لەیلیٚ‌وهەجنوون ، لەناو ئەدەبی تورك‌داو هۆی گۆیزانەوەی[٥] !

چووارەم : هەواڵی لەیلیٚ‌ومەجنوون ، لەناو ئەدەبی نویٚ‌ی[٦] عەرەب‌داو هۆی رەنگدانەوەی رووالەتی نویٚ‌ی‌عارەبی متوربەکراو بە رووالەتی بیٚگانە .

پێنجەم : هەواڵی لەیلیٚ‌و مەجنوون ، لەناو ئەدەبی کوردیی‌داو دەستینشان‌کردنی رووالەتی‌عارەبی‌و فارسی‌و تورکی ، لەگەڵ کەفەسەربوونی بە رووالەتی تایبەتی کوردەواریی[٧] ، بۆ وێنە ، دەست بۆ لەیلیٚ‌ومەجنوونی سەیدی‌هەورامی‌و وەلی‌وشەمی[٨] وەلی‌دیٚوانەش رادەکیٚشریٚت .

## لەیلیٚ‌ومەجنوون ، لەناو ئەدەبی کۆنی‌عەرەب‌دا :

رازی دەماودەمی‌و جۆراوجۆری گوێزراوەی ناو هەندێك سەرچاوەی جۆربەجۆری ، بۆ وێنە ، وەك ؛ «الاغانی – لابی‌فرج الاصبهانی» و بەرهەمی «حافظ» و «ابن الکلبی» – ئەگەر باوەڕنەکردنی – الاصمعی – لیٚ دەر بکەین ؟ – وامان بۆ دەگێڕنەوە ، کە لەزەمانی کۆن‌دا کوڕێك هەبوە ، ناوی (قەیس) ی کوری مەلوحی کوڕی موزاحیمی عامیری بووەو ناوبانگی بە (مەجنوون) ی (لەیلیٚ) دەرکردووە .

لەداخی ئەوەدا ، کە لەیلیٚ‌ی نەدراوەتیٚ ، چۆڵی بیابانی نەجدوحیجازی ، کردووە بە لانەی خۆیی‌و وەختێکیش بە مردوویی لەویٚ دەیدۆزنەوە .

هەندێك لەوانەی ، کە ئەم رووداوە بە ڕاست لەقەڵەم[9] دەدەن ، دەیبەنەوە بۆ ساڵەکانی (٦٨)ی کۆچی . هی‌وەهاش هەیە ، کەوەك (الاصمعی) بیٚ – دان بە بوونی مەجنوون‌دا ، هەرگیز ، نانێت !

## رووالەتە بنچینەیی‌یەکانی ئەم‌رازی‌لەیلیٚ‌و مەجنوونە

بەلای منەوە ، ئەم رازی‌لەیلیٚ‌و مەجنوونەی کۆنی ناو ئەدەبی کۆنی عەرەبی ، ئەم رووالەتانەی پێوە دیارە :

**یەکەم** : هەر لەبەر ئەوەی ، کە خۆشەویستی لەیلیٚ‌ومەجنوون بلاٚو بووەتەوەو قەیس شیعری بە لەیلیٚ‌دا هەڵ‌داوە ، باوکی لەیلیٚ ، لەیلیٚ‌ی بە قەیس نەداوە – ئەمە بەپیٚ‌ی ڕەویەو رەوشت‌و نەرێتی ناو عارەبی کۆچەر .

**دووەم** : قەیس‌ولەیلیٚ ، هەر لە منداڵی‌یەوە ، پێکەوە بەرخ‌و کاریان لەوەڕاندووەو بۆیە لە منداڵی‌یەوە ، حەزیان لەیەکتریی کردووە .

**سێیەم** : قەیس لەبەر ئەوەی کە لەیلیٚ‌یان نەداوەتیٚ بۆیە ، چۆڵ‌و بیابانی نەجدی گرتووەتە بەرو کردوویەتی بە ئارامگای هەتا هەتای خۆی !

**چووارەم** : لەیلیٚ دەدریٚ بەشوو ، ئەوجا قەیس شیٚت و لیٚوە دەبیٚت و سەری خۆی هەڵدەگریٚ .

**پیٚنجەم** : خۆشەویستی عوزری[10] لە سەرانسەری دڵداریەکەیان دا بەرپایە .

شایانی باسە ، پاش بەرپا بوونی ئەو رازە دەماودەمیە ، شاعیریٚکی عەرەب ، شیعریٚکی غەزەلی نەوتوە ، ئەگەر بە ویٚنەیێ ، لە ویٚنەی رووداوەکانی لەیلیٚ و مەجنوون ، نەی رازاندبیٚتەوە !

هی وەهایان هەیە ، بە پیٚی بیرواری تیٚگەیشتنی خۆی بە دیٚرە شیعریٚك رووداوی ، یان سەرگوزەشتەی ، لەیلیٚ و مەجنوونی بەسەر کردووەتەوە . هی وەهاشیان هەیە[11] بە چەند دیٚرە شیعریٚك رازیی نەبووەو بۆ قەسیدەیەك دەمی کوتاوە .

بە هەرحالٚ ، تۆمار کردنی رازی لەیلیٚ و مەجنوون ، بە زمانی عارەبی ، بە ویٚنەی گفت و گۆی هۆنراوە ، تەنها لە لایەن (ئەحمەدشەوقی) ، وەك دەستپیٚشخەریٚك ، کراوەو ئەم باسەش دەخەینە ناو خالیٚ (هەوالیٚ لەیلیٚ و مەجنوون لە ئەدەبی عارەبی دا) .

## هەوالیٚ لەیلیٚ و مەجنوون لە ئەدەبی پارسی دا[12]

لە ئەدەبی پارسی دا ، بە زۆر شیٚوە ، هەواڵە جۆر بەجۆرەکانی خۆشەویستی نیٚوان لەیلیٚ و مەجنوون . ، لە چواچیٚوەی ئاوازیٚکی بەسۆزی ریٚك و پیٚك دا داریٚژراونەتەوەو لە زۆرشت دا ، ئەو هەواڵە تۆمارکراوانە ، یەك دەگرنەوەو لە هەندیٚ شتیش دا جیاوازیی لەگەلٚ یەکتریی دا دەنویٚنن .

**بۆ گویٚزانەوی لەیلیٚ و مەجنوون ، بۆ ئەدەبی پارسی و تۆمارکردنی لە چوارچیٚوەی** ئاوازی هۆنراوەی بە سۆز دا . **دەستپیٚشخەریی** بۆ «نظامی گەنجەوی» دەگەریٚتەوە . شویٚنکەوتووەکانی ، یان بابلیٚین ، چاولیٚگەرییکەرەکانی «سەعدی شیرازی» و «خەسرەوی» و «دەهلەوی» و «جامی» و «هاتفی» بوون .

**(نظامی - ۱۱٤۱ - ۱۲۰۳) :**

گەنجەوی ، لەیلیومەجنونی لەناو هۆنراوەیەکی فراوانو بەسۆزدا پێشکەش کردووە .

سەرەتاکەی ، کە نزیکەی چوارسەد دێرە شیعرە ، بە تاریف‌دانی پێغەمبەرو شەوی میعراجو سەرگوزەشتەو بیرەوەریی‌ی خۆشەویستانو دۆستانیەوە هەڵی داون .

ئەوجا دێتە سەر رازی لەیلیٚومەجنوون ، کە بەم جۆرەیە : —

**شایەکی** گەورەو بە دەسەلاٚتو ئۆجاغ کوێری عەرەب ، باش پارانەوەیەکی زۆر لەخوا ، کورێکی دەبێتو ناوی(قەیس)ی لیٚ دەنێتو بەتەمایە **کە ببێت بە** جێگەداری

لە تەمەنی(٥) سالاٚنی‌دا ، لەگەلٚ کورانی پیاوماقوولاٚنی هۆزەکەیان‌دا ، بۆ قوتابخانە دەنێررێت ، کە کوروکچ تیایی‌دا ، پێکەوە دەخوێنن .

**قەیس ، لەقوتابخانە لەگەلٚ لەیلیٚدا** ،کە کچێکی زۆرجوان دەبێت حەز لەیەکتریی دەکەن . ئەم حەزلیٚ‌کردنەیان دەبێتە جێگای وات‌وێتی خەلٚكو بەم بۆنەیەوە ، واز لە خوێندن دەهێنن !

قەیس ، سەری خۆی هەلٚدەگریٚو نەجد دەکات ، بە ماوای خۆی ، بۆ ئەوەی دوور بکەوێتەوە لەبیستنی هەموو دەنگ‌وباسێك ، جگە لە بیستنی هەواڵی لەیلی !

خزم‌وکەس‌وکاری قەیس ، قەیس ، بۆ کەعبە دەبەن ، بۆ ئەوەی لەخوا بپارێنەوە ، تاوەکو چاك بێتەوە . قەیس لەبریی ئەوەی، بەگوێ‌ی ئەوان بکات ، لەخوا پارایەوە ،کە عەشقی زیاتر بکات .

لەیلیٚ ، دەچێت بۆ ناوباخێکی دیمەن‌جوانو رازاوە (دیمەنێکی باخەکانی کوێستانەکانی ئێران) ، بە رێکەوت «ئیبن سەلام» دەیبینیٚو حەزی لیٚ دەکاتو بۆ خوازبێنی‌ی دەنیریٚو دەیدرێتیٚ :

بە هۆی پەنابردن بۆ شاە‌نۆفل» ، شاە نۆفلٚ لەگەلٚ هۆزوکەس‌وکاری لەیلیٚدا دەجەنگیٚو دیلیان دەکاتو مەجنوونیش (قەیس) بەم زەلیل کردنەی کەس‌وکاری لەیلیٚ لە لایەن «نۆفلٚ» — ەوە ، نارازی دەبێت .

مەجنوون ، بۆ دەشتو بیانان ، سەرلەنوێ دەگەڕێتەوەو بە ڕێکەوت ، بە دەست راوچی‌یەکەوە ، ئاسکێك دەبینێتو داوای بەردانی ئاسکەکەی لێ دەکاتو ئەویش بەرەڵای دەکات .

عارەبێك ، بەلای مەجنووندا تێ دەپەڕێتو هەواڵی شووکردنی لەیلێ‌ی پێ‌دەگەیەنێتو ئەویش زیاتر شەیداو لێوەو سەرگەردان دەبێت .

باوکی قەیس ، دەمرێت ، قەیس – یش دەچێتە سەر گۆڕەکەی زاری‌یەکی زۆری بۆدەکاتو دیسان بۆ چۆڵەوانی خۆی دەگەڕێتەوە .

چیرۆکی شای «مەرۆ – و» پیاوەکەی‌و سەگەکانی بەخەو دێتە خەویەوە . رۆژ دەبێتەوە ، هەواڵ بۆ لەیلێ هێنرا ، نامەی لەیلێ‌–ش بۆ قەیس – بە هۆی خدری زیندەوە – بردرا .

رووەو (پایز) ، لەیلێ نەخۆش دەکەوێتو دەمرێت ، قەیس ، کەبەم هەواڵە دەزانێت دەچێتە سەرگۆڕەکەی‌و لەداخاندا ئەمیش دەمرێت .

## سەبارەت بە رازی لەیلێ‌ومەجنوونی ئەوانی دیکەوە .

سەبارەت ، بە رازی لەیلێ‌ومەجنوونی «سەعدی» و «دەهلەوی» و «جامی» و «هاتفی» یەوە ، ئێمە ، لێرەدا ، لەبەر دووبارە نەبوونەوەی رووداو ، یان سەرگوزەشتە ، هەو تەنها لایەنی جیاوازی‌یەکان دەخەینە روو .

ئەوەی ، کە وەك جیاوازی خۆی دەنوێنێ ، لە لەیلێ‌ومەجنوونی دەهلەوی‌دا ، ئەمەیە :

(١) – قەیس ژنی بۆ دەهێزێت – بەڵام لەکاتی دیتن‌دا ، تەڵاقی دەداتەوە .

(٢) – مەجنوون لە هەوارگەیەکی کۆن‌دا ، سەگێکی بریندارو بە ئازار دەبینێتو دڵی بۆی دێتەوە یەك .

(٣) – لەگەڵ دەستە خوشکانی‌دا ، لەیلێ ، بۆ ناوباخ وباخاتو گوڵزارێك دەچێت (لە هی نەجد ناکات) و لەوێ گەنجێك بەرێککەوت لەیلێ دەبینێتو ئەوگەنجەش باسی مردنی قەیس : بۆ لەیلێ دەکاتو دەستبەجێ ، لەیلێ‌–ش بێ‌هۆش دەکەوێتو بۆ ماڵەوەیان دەیبەنەوە .

قەیس بەم نەخۆشیەی لەیلیٚ ئاگادار دەبێت ، وەختی ، کە دێت ، بەتەرمەکەی‌دا دەگات .

(٤) – قەیس شوکرانەی خوا دەکات .

## جامی (١٤١٤ – ١٤٩٢)

جامی لە گفت‌وگۆی‌دا شوێنکەوتووی (نظامی) یەو لە سۆفیگەریەتی نێوی رازەکەی‌دا ، شوێنکەوتووی دەهلەوی‌یە .
ئەوەی کە جیاوازیی بنوێنی ئەوەیە :–

(١) – قەیس ، بە گەورەیی‌و لاویی حەزی لە لەیلیٚ کردووەو هەواڵی قەیس – یش ، وەك : کوڕە دەوڵەمەندێکی دەست‌رۆیشتوو ، بە ئێمە دەگەیەنێت .

(٢) – قەیس ، پێش ئەوەی حەز لە لەیلیٚ بکات ، حەزی لە (کەریمە) کردووەو بۆ ماوەیەکیش بەقسەی خۆش پێکەوە دەبەنە سەر . ئەم (کەریمە) یە قەیس بەجیٚ دەهێڵێت .

لەم گۆڕانەدا ، قەیس ، چاوی بە لەیلیٚ دەکەوێت‌و حەزی لیٚ دەکات .
کۆسپی، زۆر دێتە بەر رێگای ئەو خۆشەویستی‌یەیان‌و گەورەترینی ئەو کۆسپانەش **هاوشانیەتی‌یە !**

لە پێناوی گەشەکردنی ئەو عیشقەدا ، قەیس ، بۆ حەج دەچێت‌و ئەو (پەیڕەوە) لە بەرچاوی خۆی‌دا دادەنێت ، کەدەڵێت : (دوورکەوتنەوە لەحەزی خۆشەویستی باشترە لە یەك‌گرتنی) . لێرەدا ، پیرەژن هەوالیٚ بەرە . باوکی لەیلیٚ لای خەلیفە شکات لە قەیس دەکات . لەیلیٚ بۆ حەج دەچێت . کوڕە دەوڵەمەندیٚ داوای دەکات‌و دەیدەنیٚ .

قەیس ، بە هۆی ئەم روو داوەوە تێك‌دەچێت‌و کە دەدۆزێتەوە ، بە دەستەملان لەگەلیٚ ئاسکێك‌دا ، هەردووکیان مردوون .

لەیلیٚ ، کە هەواڵی مردنی قەیس پیٚ‌دەگات دەست‌بەجیٚ ، دەمرێت .

**هاتفی (؟ - ١٥٢١) .**

هاتفی ، وا لە قەیس دەکات ، کە هەر لەمنداڵی‌یەوە گرینۆك بێت‌و کاتێکیش کە دەم‌وچاوی نزیك دەم‌وچاوی کچێکی جوان دەبێتەوە لە گریانەکەی ، دەست‌بەجێ ، ژیروئاشت دەبێتەوە .

بە هۆی ئەوەوە ، کە قەیس لە مەجلیسی خوازبینی‌کەران‌دا سەگی لەیلیٚ بە باوەشیەوە دەگرێت ، باوکی لەیلیٚ ، قەیس بەشێت‌و لێوەی دەزانێت‌و لەیلیٚ ناداتیٚ !

ئەمیر نەوفلٚ ، پاش جەنگ لەگەڵ خزم‌وکەس‌وکاری لەیلیٚ‌دا ، لەیلیٚ بە دیلی دەکەوێتە دەستی‌و بەزەیی پیادا دێتەوەو مارەی دەکات‌و پیلانیش دادەنیٚ ، کە قەیس بە ژەهر بکوژرێت ! بەڵام ئەمیر نەوفلٚ خۆی بە نەزانی ژەهرەکە دەخواتەوەو دەمرێت .

## هۆی گۆیزانەوەی رازی لەیلیٚ‌ومەجنوون

بە لای منەوە ، چەند هۆیەکی سەرەکی ، بۆ گوێزانەوەی رازی لەیلیٚ‌ومەجنوون ، بەدی دەکرێن :

(١) – دڵداری‌و خۆشەویستی ؛ بە هەموو جۆرەکانیەوەو ئەنجامە جۆربەجۆرەکانی ، لەهەموو دەم‌ووەختێك‌داو لەهەموو چەرخێك‌دا هەیەو لەناو هەموو نەتەوەیەك‌دا ، ناتوانریٚ دەستی لیٚ هەڵبگیری !

(٢) – رۆشنبیری عارەبی ئیسلامی ، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی‌دا بە ناو سەرپاکی ، ئەو نەتەوانەدا ، کە چووبوونە ژێر ئاڵای ئیسلامەتی‌یەوە بڵاو بوو یەوەو رۆشنبیرانی هەر نەتەوەیەکیش بەربەرەکانی هێنانە ناوەوەی ئەو رۆشنبیری‌یەی دەکرد ، بەو پیٚ‌یە ، کە شتێکی نویٚ‌یە .

(٣) – بوونی رازی جۆراوجۆری لەیلیٚ‌ومەجنوون ، بوونە هۆی قۆزینەوەیان‌و دارشتنیان ، سەرلەنویٚ ، لە ناو ئاوازی هۆنراوەدا .

(٤) – گونجانی رازەکە ، بۆ هاویشتنی لق‌وپۆپی سۆفیگەریەتی بە تایبەتی ، ئەگەر زانیمان ، ئەوانەی ، کە خەریکی ئەم رازە بوونَ سەرپاکیان ، لایەنی سۆفیگەریەتی‌یان گرتووە .

## دیمەنی عارەبی رازەکان

سەرپاکی ناوەکانی ناو رازەکە ، ناوی عارەبین . رێگاوبان‌و چوڵ‌و بیابانەکە ، بەناو هی نەجدو حیجازە . لە زوربەی زۆری رازەکان‌دا ، هەر لەبەر ئەوەی کە هەواڵی حەزلی‌کردنی لەیلیٚ‌وقەیس ، گەیشتووەتە ، ناوهۆز ، باوکی لەیلیٚ ، نەیتوانیوە لەیلیٚ بە قەیس بدات ، لەبەر رەویەونەرِیتی هۆزگەریەتی‌و کۆچەری ناو عەرەب .

## دیمەنی ناعارەبی رازەکان

یەکەم ، قەیس دەچێتە قوتانجانەکەوە ، کە کورِوکچ پێکەوە دەخوێنن . دووەم ، لە شاخەکانی نەجددا ، بەفر دەبارێنن ، بە جۆرێك ، بە هۆی بەفرەوە بۆ چەند مانگێك ساف‌وسۆلٚ دەبن . سەهۆڵبەندان‌و یەخبەندان بەرپا دەبێت . سێیەم دیمەن‌و ناوەوەی ئەو باخانەی ، کە لەیلیٚ‌یان بۆ دەچێت ، لە باخ‌وباخاتی (واحە) کانی عەرەبستان ناکەن ! چوارەم ، هەندیٚ خۆراك‌و خواردەمەنی‌و سەنگ‌و کێشانەو پارەو جۆرە قوماشێك بەکار دەهێنرێن ، کە لە شارستانە گەورەو پێشکەوتووەکان‌دا ، نەبێت دەست ناکەوێت .

## لەیلیٚ‌ومەجنوون ، لە ئەدەبی عارەبی نوی – دا

ئەحمەد شەوقی‌و لەیلیٚ‌و مەجنوون :

ئەوەی ، کە لە شانۆگەریی لەیلیٚ‌ومەجنوونی ئەحمەد شەوقی‌دا ، بەدیی دەکرێت ، بەم جۆرەیە :

جێگاکەی ، لەبیانانی نەجدو حیجازدایەو لەچەرخی (بەنی‌ئومەیی‌یەکان) دایە .

جەوهەری باسەکەی ، لە کتێبی «الاغانی» یەوە وەرگرتووە .

## کورتەی رازەکەی :

قەیس ، حەزی لە کچی مامی ، کە (لەیلی) یە ، کردووە . شیعری پیادا هەڵداوەو ئەم شیعر پیاهەڵدانەش بلاّو بووەتەوە . قەیس داوای (لەیلیٚ)ی کردووە ، بەلاّم لەبەر ئەو (چاوونامە) باوکی لەیلیٚ ، لەیلیٚ — ی نەداوەتیٚ .

باوکی لەیلیٚ ، لەیلیٚ ، بو (ورد الثقفی) مارە دەبریٚت‌و لەبەر ئەوە ، قەیس نەخۆش دەکەویٚت‌و شیٚت‌و لیٚوەو سەرگەردان دەبیٚت‌و لەیلیٚ-ش بە هۆی ئەوکارەوە ، نەخۆش دەکەویٚت‌و زۆری پیٚ ناچیٚت هەردووکیان دەمرن .

لیٚرەدا ، بۆنی کەسیٚکی سیٚیەمی زۆردار ، بەدیی کراوە ، ئەویش (ئیبن عەوف)ە کە دەبیٚت بە واسیطەیەك بۆ ئەوەی داوای لەیلیٚ بۆ قەیس بکات . بەلاّم نەدانی ، دەبیٚتە هۆی بەرپا بوونی شەری نیٚوان هەردوو «لا» و لە ئەنجامدا ، جگە لە باوکی (لەیلیٚ) و (ئیبن عەوف) کەسی دیکە نامیٚنیٚتەوە .

باوکی لەیلیٚ ، لەیلیٚ دەکات ، بە سەرپشك ، بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی شوو بە هەرکەسیٚ دەکات ، بیکات . بەلاّم لەیلیٚ خۆی شوو بەقەیس ناکات — هەر لەبەر لۆمەی هۆزو هۆزگەریەتی ، شوو بە (ورد الثقفی) دەکات ، ئەگەرچی لە دلٚدا ، لەو کردەوەیەی خۆی پەشیمانە !

مەجنوون سەری خۆی ، بەرەو چۆڵەوانی هەڵدەگریٚو لە پاش‌دا ، بە هۆی شەیتانەی ئومەوی‌یەوە ، بۆ ناو ئاوایی‌یەکەی هۆزی سەقەفی دیٚتەوەو ئا لەویٚ ، بە پیٚی وتنی (وەرد) خۆی قەیس‌و لەیلیٚ ، لە ماڵی (وەرد) دا ، وەك (براوخوشك) پیٚکەوە دەژین .

قەیس ، دەیەویٚ ، لەیلیٚ فریو بدات ، بەلاّم پیٚی فریو نادریٚت‌و بۆیە ، لەگەڵی ناروات‌و دۆی ناکەویٚ . پاشان قەیس دەمریٚو لەیلیٚ-ش لە داخی مردنی قەیس‌دا ، دەمریٚ .

## جەوهەری رازەکە :

لەیلیٚ کچیٚکی عارەبی کۆچەرە دڵسۆزە بۆ پاریٚزگاری کردنی کچیٚنی خۆی‌و بە

تەنگەوەی گەشە سەندنی خۆشەویستی‌یەکەیەوەیەتی‌و دەستی بە هەڵس‌و کەوت‌و نەریتی هۆزگەریەتی عارەبی‌ی کۆچەری‌یەوە گرتووە .

**ئەوەی کە تیای‌دا بەدیی دەکرێت :**

**یەکەم** ، لەیلیٚ وەك هەر مرۆڤێك ، زیاتر بیر لە سومعەی خۆی دەکاتەوە ، تاوەکو شوێنکەوتنی هەست‌و لەززەتی هەوەسی خۆی ، بۆیە هەمیشە ، نارازی‌یە ، بەو شووەی ، کە کردوویەتی ، بەڵام کردوویەتی !

**دووەم** ، باوکی لەیلی، لەیلیٚ دەکات بەسەرپشك ، بۆ ئەوەی خۆی یەکێك هەلٚبژێریٚ ، تاوەکو شووی پیٚ بکات .

**سێیەم** ، (وەرد) ، گویٚ بەوە نادات ، کە لەیلیٚ ، لەگەلٚ قەیس‌دا ، لەماڵەوە پێکەوە دانیشن ، یاخود ، بە گفت‌وگۆوە بەسەری بەرن . یا ئەگەر (وەرد) لەماڵەوە نەبێت ، قەیس‌ولەیلیٚ ، بۆیان هەیە لەماڵەوە پێکەوە بن ! چونکە وەك براو خوشك بن وایە !

**چوارەم** ، قەیس ، هەوڵی‌ئەوە دەدات ، کە لەیلیٚ رەدوی خۆی بخات ، بەڵام لەیلیٚ لەگەڵی‌دا ناڕوات !

**هەندێك تیٚبینی لەم ڕازەدا :**

ڕازەکە ، جگە لە رووالەتی عارەبی ، بە هەندی بیروڕای بێگانەشەوە . بەتایبەتی بە هەڵس‌و کەوتی کۆمەلایەتی فەرەنساوی‌یەوە متوربە کراوە . ئەوانەیش ، بەلای منەوە ئەمانەن :

**یەکەم** ، هەرگیز ، هیچ عارەبێك ، رازی نابێت بەوەی ، کە دڵداری ژنەکەی ، لەگەلٚ ژنەکەی‌دا دوو بەدوو دابنیشن ! .

**دووەم** ، ئافرەت ، یان (کچ) لە کۆمەڵگای عارەبی کۆچەردا ریٚی نەدراوە کەسەرپشك بیٚ بۆ هەلبژاردنی شووی !

**سێیەم** ، هەوڵدان بۆ فریودانی لەیلیٚو بۆ رەدووکەوتنیو نەرۆیشتنی لەیلیٚ ، بەو نیازەی ، زانایە ، لە باشیو خراپیداو ئۆستایەو کامڵە لە هەڵبژاردنی بەشداری ژیانیدا ، زۆر دوورە لە نەریٚتی کۆچەریەتی عارەبەوە .

ئا ، ئەمانەی سەرەوە ، بیٚگومان لایەنی نویٚکارین ، کە باووبرەوی بیٚگانە کاریان سەر نووسەر کردووەو ئەو باووبرەوانەش ، وا لە بەرهەمی نووسەردا رەنگیان داوەتەوە .

## لەیلیٚومەجنوون لە ئەدەبی تورکیدا .

بەهۆی بەرپابوونی ئاینی ئیسلامەوەو بلاٚو بونەوەی رۆشنبیریی عارەبی ئیسلامییەوە ، خەڵکانی ناعەرەبی ئیسلام بەربەرەکانی ئەوەیان دەکرد ، بە تایبەتی لەلایەن رۆشنبیرانەوە ، کە بە زووترینکاتو بە قەوارەیەکی فراوان ، ئەدەبو رۆشنبیریی ئیسلامی ، کە نویٚترین رۆشنبیریی بووە ، لەوکاتەدا ، بگویٚزنەوە بۆ ناو رۆشنبیریی خۆیان ، بە مەبەستی نویٚخوازیو گەشەپیٚدانو بەرەوپیٚش خستن .

تورکەکانیش ، یەکیٚ بوون ، لەو گەلانەی ، کە تینو بە گویٚزانەوەی رۆشنبیریی ئیسلامی عارەبی بووەو هەوڵی گویٚزانەوەی زۆرشتی داوەو ویٚنەیەکیش لەوانەش ، یان لەو شتانەش ؛ رازی «لەیلیٚومەجنوون» بووە .

شایانی باسە ، هەر لەبەر ئەوەی ، کە تورکی نازانم ، بە دوای سەرچاوەی عارەبی ، کەلەو رووەوە زانیاریی تیٚدا بیٚت زۆر گەرام ، بەلاٚم بە داخەوە ، ریٚم تیٚی نەکەوت ، جگە لە تەنیا ژمارە (دە = ١٠) ی گۆڤاری کۆلیٚجی ئەدەبیاتی زانکویٚ «المستنصریە» نەبیٚ ، کە تیایدا ، وتاریٚك بە ناوونیشانی «لەیلیٚو مەجنوون لە ئەدەبی تورکیدا» ، کە لە لایەن (د . جوبان خضر حەیدەر) ەوە بلاٚو کرابوویەوە .

باسەکە ، زۆر کورتە ، شتیٚکی ئەوتۆی بە دەستەوە نەداوە جگە لەوەی ، کە ناوی چەند کەسیٚکی ریز کردووە ، کە رازی لەیلیٚو مەجنوونیان بۆ ناو ئەدەبی تورکی گویٚزاوەتەوەو واشی لە قەڵەم داوە ، کە یەکەم گویٚزانەوەی رازی لەیلیٚو مەجنوون بۆ ناو ئەدەبی تورکی ، بۆ (اورفلی شاهدی – ؟ – ١٤٨٢) ی شاعیر دەگەریٚتەوە .

ئەوجا ، نووسەر ناوی چەند کەسێ ، کە رازی لەیلێ‌ومەجنوونیان بە شیعر دارشتووە ، ریز دەکات‌و تا دێتە سەر شاعیری بەناوبانگ «فضولی» ، کە ناوی بەگەورەترین شاعیری ئەو سەردەمە دەبات .

نووسەر ، بە داخەوە ، باسی ناوەڕۆکی رازەکەی لەیلێ‌ومەجنووی نەکردووە . ئەوەی ، کە وتوویەتی ، ئەوەیە ، کە رووالەتێکی نوێی تورکی‌و بنەرەتێکی عارەبی ، تێکەلێ بەیەکتری کراون‌و بە هۆی (٣٤٠٠) دێرە شیعرەوە ، رازی لەیلێ‌ومەجنوونی رازاندووەتەوە .

## لەیلێ‌و مەجنوون لە ئەدەبی کوردیدا :

پێش ئەوە برۆینە سەر ئەدەبی نووسراومان ، دەبێ دان بەوەدا بنێین ، کە لەو رۆژەوە ، دینی ئیسلامی لە کوردستان‌دا ، بلاوبووەتەوە ، عاشقانی دین‌و خوێندەواریی‌و رۆشنبیریی هەولی ئەوەیان داوە ، کە زۆر نەبێ کەم ، لە رۆشنبیریی ی ئیسلامی بهێنە ناو کوردەواری‌یەوە . هەر لەم رێگەوە ، بە دەیان رازو سەرگوزەشتەی عارەبی ئیسلامی لەناو کوردەواری‌دا بلاو بووەتەوە ، پاش ئەوەی متوربەکراون بە بیروهۆش‌و هەلس‌وکەوتێك ، کە شایانی بلاو کردنەوەی ناو کوردەواریی بن ، یان لەگەلێ نەرێت‌و باووبرەوی نێوانیان‌دا بگونجێن .

لەم بابەتەی‌ئێرە ، لە ناو کۆمەلگای جۆراوجۆری ناوچەکانی کوردستان‌دا ، زیاتر لە جۆرێك ، رازی دەمی‌ی لەیلێ‌ومەجنوون ، لە ناو خەلکی نەخوێندەواری کوردستان‌دا هەیەو بلاوە . تەنانەت ، لە ناو دایکەکان‌دا ، بۆ وێنە هەندێکیان هەن ، کاتی لاواندنی مندالەکانیان ، بە تایبەتی لە کاتی شەوی هاوینان‌داو دەمی نووستن ، روو دەکەنە ئاسمان‌و دەست نیشانی دوو ئەستێرە دەکەن ، کە یەکێکیان زۆر گەش‌و رۆشنەو ئەوی دیکەشیان زۆرکزە ، گوایا گەشەکەیان لەیلێ-یەو کزەکەشیان مەجنوون . ئەوجا باسی خۆشەویستی و بەیەك‌نەگەیشتنی هەتا هەتایان دەکەن .

ئەوەی ، کە دەبێ ، لێرەدا ، باس بکرێت ئەوەیە ؛ کە ئەم جۆرە رازە دەماودەمیانە ، سەرپاکیان لەوەدا یەك دەگرنەوە ، کە لەیلێ‌ومەجنوون لەم دنیایەدا ، نەیان‌توانیوە یەك بگرن ، بەلام **لەو** دنیادا یەك‌دەگرنەوە .

## رازی لەیلیٚ‌ومەجنوونو شاعیرانمان :

بەوەوە ، زۆر خۆمان خەریك‌كرد ، كە هۆنراوەیەكی غەزەلی شاعیریٚ بدۆزینەوە ، كە بۆ وێنە ، ناوی لەیلیٚ‌ومەجنوونی نەهێنابیٚو تیایا سەر نەكەوتبێت . ئەوجا ، ئەو وێنەیە ، بە قەوارەی وشەیٚ درێژ بووە ، یان كورت ، بە هۆیەوە توانراوە شتیٚ دەربارەی لەیلیٚ‌ومەجنوون — ەوە بە دەستەوە بدات .

هەر لەبەر ئەوەی ، كە لێرەدا ، ماوەی وێنە هێنانەوەی زۆرمان نی‌یە ، بۆیە ، رازیٚ دەبین بە رازی «وەلی‌وشەم» و هی «دڵەی شەیدای‌هەست» ی سەیدی‌هەورامی‌و ئەوەی «دەباغیان» .

بەرهەمی «وەلی‌وشەم» بە چەند جۆریٚ بلاٚو بووەتەوەو هەموویان لەوەدا یەكانگیر دەبن ، كە وەلی هەژارەو شاعیریشەو حەزی لە كچی سەرەك خێڵیٚ كردووەو ئەو كچەش ناوی «شەم» بووەو ئەویش حەزی لە «وەلی» كردووەو لە كۆتاییدا ، شەم بە وەلی نەدراوەو ئەمیش بەو هۆیەوە شێت‌و لێوەو سەرگەردانی هەرداو هەردی ناوچەی گەرمیان بووەو بە نائومێدی سەری ناوەتەوە .

شایانی باسە ، وا رێك دەكەوێت ، كە شەم بۆ لای وەلی برواو پێكەوە شیعر بە یەكتریدا هەڵ‌ دەن‌و ماوەشیان هەیە ، كە بتوانن لەو ماوەیەدا دوور بكەونەوەو بەو جۆرە بۆ یەكتریٚ ببن ، كەچی ریٚ بە خۆیان نادەن ، كە شتی وەهایان لیٚ بووەشێتەوە .

## رووالەتی ئەم رازە :

سەرپاكیٚ رووالەتەكانی هی ناو هۆزگەریٚ كوردەوارین ؛ دیمەنی رێگاوبان ، گەرمیان‌وكوێستانی ناو جافەتی ، گفت‌و گۆو نەرێت‌و هەڵس‌و كەوتی خێڵگەریٚ . ئەوەی ، كە لە رازی لەیلیٚ‌ومەجنوون دەكات ، تەنیا ، ئەوەیە كە شەم بە وەلی نلابریٚ ، هەردووكیان ، بەو داخەوە ، سەردەنێنەوە .

## رووالّەتی سۆفیگەری‌یەتی ناو رازی وەلی‌و شەم :

ئەوەی کە تیای‌دا ، بە دیی بکرێت‌و لە رووالّەتی سوفیگەری‌یەتی‌یەوە نزیك بێت ، ئەوەیە ، کەبۆ زۆرجار رێك دەکەوێت ، کە بەیەکتریی بگەن ، بەلاّم لەم بەیەك‌گەیشتنەدا هەڵس وکەتیان وایان لیّ‌دەکان کە تینوویەتی خۆشەویستی‌یەکەیان بە هێزتر دەبێت .

## رازی لەیلیّ‌ومەجنوونی سەیدی هەورامی :

سەیدەی هەورامی ، لەقەسیدەیەکی پەنجاویەك دیریی‌دا ، بە ناوونیشانی «دڵەی شەیدای مەست» ەوە سەرزەنشتی «دڵی» خۆی دەکا ؛ کە مەجنوون چۆنە لەگەڵ لەیلیّ‌دا ، ئەمیش دەبیّ وەها بیّ‌و ئەوجا ، بەسەرهاتێکی بچکۆلەی «مەجنوون» لەگەڵ سەگی لەیلیّ‌دا کردوویەتی ، بۆ دڵی‌خۆی دەگێرێتەوەو دەڵێت :

رۆژێك لەرۆژان ، مەجنوون حاڵی زۆر پەشێوەو ئارەزووی دیدەنی کردنی لەیلیّ–یەتی‌و لەتاودا کەوتە گەرانی چۆڵ‌وهەرداو هەرد ، تا گەیشتە کۆنە هەوارگەیەکی لەیلیّ . تەماشای کرد لەهەوارگەکەی‌دا جگە لە لەتە دیوارەبەردێك ، چی‌تری بەسەر یەکەوە نەماوە . لەبنی دیوارەکەدا سەگێکی ریش‌و برینداری دیی ، کە بە ئازارو ئێشەوە دەناڵێنیّ !

مەجنوون لیّ‌ی ورد بوویەوەو سەگەی ناسیەوە . مەجنوون لەداخی ئێش‌وئازارو ناڵە ناڵی سەگی لەیلیّ‌دا ، ئێش‌و ئازاری خۆی لەبیر چوویەوەو دەستبەجیّ چووە سەر جێگایەکی بەرزایی لەو دەوروپشتەداو وێستاو چاوەچاوی دیتنی خەڵکی دەکرد . راوچی‌یەکی لە دوورەوە بەدیی کرد . وەختیّ‌کە راوچی نزیك بوویەوە ، کەڵەکێویەکی کوژراوی بەسەر شانەوە بوو . مەجنوون داوای کەڵەکێوی لە راوچی‌کرد بۆ ئەوەی بیداتیّ ، تاوەکو دەرخوادی سەگی لەیلیّ–ی بدات‌و بۆ ئەوەی سەگە چاك بێتەوە .

راوچی‌یەکە ، کەڵەکێوی دایّ . مەجنوون ، کەڵەکێوی کردبە کەباب‌و دەرخواردی سەگی بریندارو نەخۆش لەیلیّ–ی دا . سەگە چاك بوویەوە .

لەوکاتەوە ، کەی مەجنوون بیویستایە بۆ لای لەیلێ بڕۆیشتابایە ، سەگ پێش مەجنوون دەکەوت‌و پاسی دەکردو بەبێ دەنگی بۆ لای لەیلێ — ی دەبرد . بێ ئەوەی ئاشووبان ببینن .

سەیدی کۆتایی رازەکەی بەوە دێنێت‌و دەڵێت :

سەگ ، بە ئێسقانێ ، وەفادار دەبێت‌و هەرگیز ئەو باشیەی لەبیر ناچێتەوە ، کەچی سیخوڕ ئەگەرچی چاکترین باشی لەگەڵدا بکەیت ، جگە لەسیخوڕی هیچ وەفایەکی بۆکەس نی‌یە !

## رووالەتی عارەبی ئەم رازە :

ناوەکان ، عارەبین — (قەیس ، مەجنوون ، لەیلێ) . هەروەها بە یەکتری ناگەن‌و ئەمەش رووالەتی سۆفیگەری‌یەکەیە ، کەتیادا رەنگی داوەتەوە .

## رووالەتی کوردەواری ناو رازەکە :

دیمەنەکان ، بە پامانی‌وزامانی دیمەنی هەوارگەکانی کوردستانەو بە تایبەتی هەردەوسەرملەکان‌و شەماڵ‌و دیواری بەردین‌و راوچی‌و کەڵەکێوی .

## لەیلێ‌ومەجنوونی دەباغیان :

کورتەی رازەکە : حەوت دێڕی یەکەمی بۆ ستایشی گەورەیی خودا تەرخان کراوە . خەو دەبینێ‌و لە خەودا تۆماری لەیلێ‌ومەجنوون دەخوێنێتەوە . بەیانی ، کە لەخەو هەڵدەستێ ، سەرپاکی رازەکەی لەبەر دەبێت . دەست بەخوێندنەوەی رازەکەو تۆمارکردنی دەکات‌و کورتەی ئەویش بەم جۆرەی خوارەوەیە :

پادشایەکی عەرەبی ئۆجاخ کوێر دەبێ : لە تافی پیریدا ، بۆ کوڕ ، لەخوا دەپاڕێتەوە . خوا کوڕێکی دەداتێ‌و بەپێی واتەی نجوومگەران‌و فاڵچیان ناوی قەیسی لێ دەنێن .

بە منداڵی ، لەتەمەنی پێنج‌ساڵانی‌دا ، بۆ قوتابخانەی لای مەلای دەنێرن ، کە

کوڕو کچ پێکەوە دەخوێنن . قەیس ولەیلیٚ حەز لەیەکتری دەکەن . ئەم چاوونامە بڵاو دەبێتەوە . بەم هۆیەوە لەیلیٚ ومەجنوون لە قوتابخانە دەهێنرێنە دەرەوە . مەجنوون لێوەو سەرگەردان دەبێت کەس وکاری قەیس دەچنە خوازبینی لەیلیٚ . هەر لەبەر ئەوەی کە قەیس تڵی لەیلیٚ دەلاوێنیٚ باوکی لەیلیٚ ، قەیس بە لێوەوشێت دەزانێت و لەیلیٚ ی ناداتیٚ .

دایکی لەیلیٚ بە کەین وبەینی لەیلیٚ ومەجنوون دەزانێت . لەیلیٚ بە ئیبن سەلام بەشوو دەدرێت . لەیلیٚ خۆی بە دەستیەوە نادات و ئەویش ، ئەو شەوە لەداخان دا دەمرێت . پیرەژنێك هەواڵی شووکردنی لەیلیٚ دەنیرێت . لەیلیٚ وەرامی نامەی مەجنوون دەنیرێتەوەو پاش پێچانەوەی نامە بە زوڵفی خۆی قاسید نامە بۆ مەجنوون دەباتەوە راوچی تووتی دەگرێت و مەجنوون بە بازی بەندی باڵی خۆی لیٚ ی دەکرێت . تووتی دێتەوە گفت و گۆو . دەبێت بە پێخامبەری مەجنون . لەیلیٚ نەخۆش کەوێت مەجنوون لەنەجد ، دەپارێتەوە ، لەخوا بۆ ئەوەی نەخۆشیەکەی لەیلیٚ بۆ ئەو بێت . دۆعا گیرا دەبێت . تووتی بەرەڵلا دەکرێت . مەجنوون بە لاڵی سەروو نە باخەوان ، لە برینەوە قوتار دەکات . مەجنوون بۆ کەعبە دەبرێت . لەیلیٚ ومەجنوون لەنەجددا بەیەك دەگەنەوە بەڵام تینویەتیان بەهۆی فریشتەوە لەیەکتری ناشکێت . مەجنوون ریٚ ی دەکەوێتە ئەو باخ وباخات وئاوەی کە لەیلیٚ خۆی تیادا شتووەو جامی زیوی لەویٚ بەجیٚ هێشتووە . لەسەرەتای پایز ، تاوەکو سەرەتای بەهار مەجنوونی لەناوگیادا نووستوو هەڵدەسێنێتەوە . لەیلیٚ دەمرێت و شیوەنی کەرەبەلارەنگی بۆ دەکرێت . مەجنوون بەمە دەزانیٚ دێتە سەر گۆڕەکەی لەویٚ دەمریٚ و دروندە ئەسپەردەی دەکەن.

**رووالەتی عارەبی رازەکە :**

ناوەکان ، سەرپاکیان عارەبین : لەیلیٚ ، مەجنوون ، قەیس . ئین سەلام بیابانی نەجد . جگە لەوەش نەبوونیان بۆیەکتری و مردنیان لەپێناوی یەکتری دا .

**هەندێك رووالەتی کوردەواری رازەکە :**

(١) – هەروەك سەرپاکی رازە شیعریەکانی دیکەی کوردیی ، ئەمیش لەسەرەتادا هەڵدانە بەخواو پێغەمەری خوادا .

(٢) – سەرپاکی دیمەنەکانی ناو رازەکە ، هی ناوچەکانی کوردستانە ،

قەلبەزەی ئاو وتافگەو سەروو ، نەرگزو دوەختی بەرزبەرزی هەمە جۆری میوەو جۆری باڵندەکانی کوێستانانو بەفربارینو یەخو سەهۆڵبەندان .

(٣) — بەکار هێنانی (شەماڵ)و (تووتی) ، بۆ نامەو پەیام بردن .

(٤) —جۆرە بەزموشایی ناو نانو خەتەنە سووورانو شایی کردن .

(٥) — ناوهێنانی جۆرە قوماشی ئاڵو واڵا باوی نێو ئەوسای کوردەواری .

(٦) — جۆری خواردن و خۆراك . ئەوانەی کە لەناو کوردەواری‌دا باو بوون .

(٧) — درینەوەی دەمی کتێب ، بۆ ناونان ، بۆ فاڵگرتنەوە ، لای شێخ چوون ، دۆعا کردن .

(٨) — جۆری ئارایشت کردنی بووك پێش گویزانەوەی ، کل ودیمە شۆرەو سپیاو سورمە ، کە لای ئافرەتی کورد بە زۆری بەکار هێزاوە .

(٩) — سەنگی کێشانەو ئامێری پێوانەی باوی ناو کوردەواریی .

(١٠) — ناو هێنانی عونسوری پیرەژن ، وەك مرۆیەکی شەڕپەرست .

(١١) — بەکار هێنانی (لاڵ)یان (بازی‌بەند) ، لە باڵوقۆڵدا .

**هەندێك لەو خاڵانەی کە هاوبەشیان کردووە :**

**یەکەم** ، دەباغیان وا لەمەجنوون دەکات ، کە هەر لەمنداڵی‌یەوە حەز لەکچی جوان بکاتو بەمەش هاوکاری لەگەڵ بیرەکەی هاتنی‌دا دەکات ، بەوەی کە لای ئەویش قەیس منداڵێکی گرینۆکەو کەی دەموچاوی نزیك دەموچاوی کچێکی جوان بوویەوە دەست‌بەجێ ژیرو ئاشت دەبێتەوەو دەیداتەوە قاقای پێکەنین .

**دووەم** ، لای سەرپاکیان جگەلەجامی لەیلێ، لەپێش مەجنوونەوە دەمرێت ، ئەوجا قەیس — یش بە دوایی‌دا .

**سێیەم** ، دەباغیان وا لەباوکی لەیلێ دەکات ، کە بەهۆی شیت‌ولێوەیی مەجنوونەوە ، لەیلێ بە مەجنوون نەدات ، لەمەش‌دا ، لەگەڵ میرخەسرەوی دەهلەوی‌دا ، یەك دەگرنەوە .

**چووارەم**، سەرپاکیان، لەوەدا یەك‌دەگرنەوە، کە لەیلێ لەپێشەوە شوو دەکات، نەك قەیس ژن‌دەهێنێ، کەچی دەهلەوی وا لەقەیس دەکات، کە ژن بهێنێو بێ‌ئەوەی بشی‌بینێ بەرەڵڵای بکاتەوە

پێنجەم، چەوهەرو بنەرەت بیرەکە عارەبی یە .

**هەندێ لایەنی جیاوازی ناو لەیلێ ومەجنوونی دەباغیان .**

لایەنی جیاوازیی، زۆر بەدیی دەکرێن، بەتایبەتی ئەگەر ویستمان لەرووی ناوەرۆکی شیعرەکانەوە بەراوردیان بکەین، بەلاَم ئەوەی کە زۆر شایانی باس بێت، بەلای منەوە، لەم خالاَنەدا خۆی پیشان دەدات :

(١) – باسی میرنەوفل، لەم رازەی دەباغیان دا نەهاتووە .

(٢) – بوونی هەندێك بالَندەو زیندەوەری وەك (تووتی)و ئاسك، کە توانای ئەوەیان پەیدا دەبێت، کە بتوانن گفت و گۆ بکەن و نامەی نێوان لەیلێ ومەجنوون بە پامان وزامانی بەرن و بێننەوە .

(٣) – پیرەژن، لەم رازەدا، هەیەو دەورێکی خراپ دەبینێ، هەروەك دەوری پیرەژن، لە رازی شیرین وخوسرەوی خانای قوبادی دا .

(٤) هاتنی، یان حازر بوونی فریشتەو کێشانی بالَی بە نێوان لەیلێ ومەجنوون دا، نەوەك کارێکی نارەوا بکەن .

(٥) – خەو پێدا کەوتنی مەجنوون، بۆ ماوەی حەوت مانگێك، (لەسەرەتای پایزەوە تاوە کو ناوەراستی بەهار) .

(٦) – مامۆستای مەلا، ڤیتنەیی دەکات و هەوالَی حەزی لەیلێ ومەجنوون بە دایك وباوکی لەیلێ دەگەیەنێت .

(٧) بوونی گۆشەیەکی شیعریی زۆر گریك کە لەهیچ کامێکی دیکەیان دا نی یە، ئەویش بەکارهێنانی پیتەکانی نووسین و هەریەکەیان بۆ سەرەتای ئاوازی شیعریی، بۆ پیاهەلَدان بەشان وبالاَی لەیلێ دا .

(٨) – لەیلێ وەك کچێکی وریاو تێگەیشتوو، ئەوە دەداتەوە بەرووی دایکی داو پێی رادەگەیەنێت، کە ئەویش رۆژێك لەرۆژانێ وەك ئەم حەزی لەیەکێك هەر کردووەو لەبەر ئەوە هەقی ئەوەی نی یە . کەلەسەر ئەوە سەرزەنیشتی بکات !

**هەندێك خال، کە بەرەوسوفیگەریەتی دەمانبەن :**

(١) – نووسەر وا لەقەیس دەکات، کە هەر لەمندالَی یەوە، وەك حەزێکی خوایی حەز لە لەیلێ بکات و لەیلێ–ش حەز لەمەجنوون بکات .

(٢) – وەختێك کە لەیلیٚومەجنوون لەناو باخ‌و گوڵزاێك‌دا یەك دەگرن، لەویٚ فریشتە(جبریل) ئامادە دەبێت‌و باڵی دەکیشتیٚ نێوان قەیس‌ولەیلیٚ‌دا. تاوەکو هەوەسیان بۆ یەکتری کار نەکات.
(٣) – بۆ دواجار، کەبە یەك ئەگەنەوە، بڕیاری یەك تەنویەك ڕۆح دەدەن‌و پەیمانی بەهێزکردنی خۆشەویستی‌یەکەیان دەدەن.
(٤) – کە هەواڵی نەخۆشی لەیلیٚ‌ی بۆ دێت، قەیس دۆعای ئەوە دەکات، کە خوا نەخۆشی‌یەکەی بۆ ئەم بنێرێت‌و خواش دۆعاکەی لیٚ قبووڵ دەکات.
(٥) – بە مردنی لەیلیٚ، مەجنوون شوکرانەی خوا دکات‌و خۆیشی بە دوایدا دەمرێت.

## ئەنجام

(١) – بەپیٚ‌ی ئەوەی، کە دەباغیان زمانی تورکی‌و فارس‌و عارەبی زانیوەو شێوەزارە کوردی‌یەکاینشی‌بە باش زانیوەو دووابەدووای ئەمانەش‌دا ئەم رازەیەی دارشتووە رازەکە خۆیشی پالپشتی ئەم لایەنەیە، کە ئەم بیرەی ناو ئەم رازە – بە لای کەمیەوە، هیچ‌نەبیٚ لە ڕووداوێك‌دا، لەگەك سەرپاکی رازە تورکیەکان ویارسیەکان‌و عارەبیەکان ئەوانەی کوردی‌بەشداری دەکات. کەوابوو بۆمان هەیە، بلێین، کە دەباغیان سەرپاکی(بیر)ەکانی لە نەخشەی بیری سەرپەردەی مێشکی خۆی‌دا، کۆی کردوونەتەوەو ئەوجا، سەر لەنویٚ‌و لەهەرجۆریٚ شتێك، کە بەلایەوە ڕەواو باش بووە وەری گرتووەو جەمی کردوون‌و سەر لەنویٚ لە بۆتەی بیروهۆشی خۆی‌و هەڵس‌وکۆمەلاّیەتی کوردەواری‌دا دایرشتوونەتەوە.
(٢) – داهێنانی لە دوو خاڵ‌دا بەلای‌منەوە کردووە، ئەوانیش:
(ئا) – جوانترین تاریفی دیمەنی لەیلیٚ‌ی داوە، بە جوزێك کە وێنەگریش هەرگیز ناتوانیٚ بەو جۆرە وێنەی زیندوو بگرێت، ئەویش بە هۆی سوخرەگرتن سەرپاکی پیتەکانی ئەلف‌وبیٚ‌وەیە بۆ ئەوەی کرنووش بۆ جوانی دیمەنی لەیلیٚ بەرن.
(بیٚ) – توانیویەتە بچێتە ناخی دەروونی پالەوانەکانەوە، توانیویەتی وا لە لەیلیٚ بکات، کە بەدایکی بلێت، هەر لەبەر ئەوەی ئەویش، ڕۆژیٚ لە ڕۆژان حەزی

لەیەکیك کردووە ، لەبەر ئەوە مافی دزژ وەستانی ، لە نێوان حەزی ئەم‌و مەجنوون‌دا ، نی‌یە .

هەروەها بەرپاکردنی دڵەچرکێ‌ی قەیس ، کە لەلایەکەوە ، یان بۆ دەمێك لەکردەوەی خۆی لەگەڵ لەیلێ‌دا رازی بێت‌و ، بۆ دەمێکی دیکەش پەشیمان بێ لەوەی کە لەگەڵی‌دا نەیکردووە! ئەمەش جۆرە خوویەکی مرۆڤایەتی‌یە ، کە بە جوانی دەباغیان وێنەی گرتووە .

پارانەوەی ، قەیس لەخوا – لەکاتی چوونە کەعبەی ، بۆ ئەوەی عەشقی لەگەڵ لەیلێ‌دا زیاد بکات ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە باوکی لێ‌ی دەویست‌و داوای لێ کردبوو .

هاتنەوەدەنگی کەعبە ، بۆ دەرخستنی مەبەسی راستە قینەی زوربەی زۆری حەج‌کەران‌و لە رووی رووالەتی دنیای‌و هەستی دینی‌یەوە ، ناسین ئەو کۆمەڵگایەو پیشاندانی مەبەستی شارراوەو ئاشکرای حەج کەرانەوە .

پتر ، لەمەش ، تا رادەیەك ، دەباغیان ، چووەتە ناخی کۆمەڵگای پەلەوەران‌و زیندەوەرانەوەو لەرازی (تووتی) و (ئاسك) ئاگادارمان دەکات .

**هەندێك لایەنی لاوازی ئەم رازە :**

من وا هەست دەکەم ، کە هەندێ لاوازی لەم رازەی دەباغیان‌دا بەدی دەکرێن‌و ئەوانیش ، بەلای‌منەوە ، ئەمانەن :

(۱) – وەختێك کە دێتە سەر باسی پارەو پووڵ‌و سەرفیات لەسنوور بەدەر باسیان دەکات .

(۲) – فرەیزی دووبارەو سێبارە بووەوەی زۆر زۆرن .

(۳) – مەجنوون وا لێ دەکات ، کە سەگی لەیلێ بە باوشەوە بگرێت ، کە ئەمە زۆر دوورە لە نەرێت‌و هەڵسی‌وکەوتی ناو کوردەواری‌یەوە بەتایبەتی ئەگەر زاینان سەگ بە سپڵەوت (گڵاو ) دادەنرێت .

(٤) – شاعیر وا لەدروندە دەکات ، کە مەجنوونی مردوو بخەنە ناو گۆرەوەو ئەسپەردەی بکەن .

## پەراوێزەکان :

(١) – عەبدولقادری دەباغیان ، کوری موتەلیبی کوری حاجی مەعروفی سەقزی‌یە . ناوبراو خاوەنی نووسینەوەی ئەم لەیلیٚو مەجنوونەیە ، بەڵام رۆشنی نەکردووەتەوە ، کە ئایا دارشتنەکەی زادەی بیری خۆیەتی ، یاخود وەری‌گێراوەو لە هی کی‌ٚوە!؟

بەهەرحاڵ ، عەبدولقادر ، ساڵی (١٣١٥)ی کۆچی ، لە نووسینەوەی رازی لەیلیٚو مەجنوون بووەتەوە .

ئەم لەیلیٚو مەجنوونەش ، لەلایەن ، مامۆستای پایەبەرزی خوا لی‌ٚخۆشبوو کاردوخی – یەوە خراوەتە سەر رێنووسی نوی‌ٚی‌کوردی‌و منیش لێکم داوەتەوەو پێشەکیشم بۆ نووسیوەو لەساڵی (١٩٨٥) لەلایەن ئەمانەتی رۆشبیری‌و لاوان ، لەچاپ‌درا .

لەیلیٚو مەجنوونی ناوبراو نزیکەی (١٥٢٦) دێرە شیعرەو بەشێوەزاری کوردی‌ی هەورامانی هۆنراوەتەوە .

عەبدولقادر دەباغیان ، بەرهەمی دیکەی لەچاپ نەدراوی هەن‌و زمانی تورکی‌و فارسی‌و عارەبی زۆر باش زانیوەو هەروەها بە باشی شێوەزارەکانی زمانی کوردی زانیوە .

یەکێك ، لەو بەرهەمانەی ، کە هێشتا لەچاپ نەدراون بەرهەمی (خاوەرزەمین)ە – هەروەك خۆی وای وتووە – لە تورکی‌یەوە بۆ شێوەی کوردی هەورامانی گۆریویەتی .

(٢) – **ئێمە سوودمان ، لەبەرهەمەکانی** دوکتور محەمەد غنیمی هیلال وەرگرتووە ، **بە تایبەتی ئەم بەرهەمانەی : (الأدب المقارن)** ، والحیاة العاطفیه بین العذریه **والصوفیه) ، بۆ چۆینەتی دانانی نەخشەو پیلانی** لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بەراورد .

(٣) – **بۆ زانینی هەوالی لەیلیٚو مەجنوون ، لە ئەدەبی** کۆنی عەرەبدا ، سوودمان لەچەند سەرچاوەیەك وەرگرتووە ، بەتایبەتی (الاغانی – ج/٢ – ١٠٠)ی (أبی فرج)و هەندێك بەرهەمی دیکەو گوی‌گرتن بۆ ئەوەی کە (الاصمعی)و (ابن الکلبی) چیان دەربارەی لەیلیٚومەجنوونەوە وتووە .

جگە لەوەش سوودمان لە کتێبی (تاریخ الادب العربي)و (الروایه الشعریه — د. مارف خزندار) وەرگرتووە .
(٤) — بۆ ئەم مەبەستە ، سوودمان ، لەبەرهەمەکانی (لەیلیٚو مەجنوون)ی (گەنجەوی)و هی (سەعدی)و هاتفی)و (دەهلەوی) وەرگرتووە .

ئەم سوود وەرگرتنەش بەپیٚی رادەی تیگەیشتن خۆمان شکاندنی تواناکمان بەسەر زمانەکەیان‌دا ئەمە لەلایەکەوە . لەلایەکی دیکەوە سوودمان لە سەرچاوەو وتارە عارەبیانە وەرگرتووە ، کە بەزمانی عارەبی ، سەربارەت بە لەیلیٚومەجنوون‌رەوە بڵاو بووەتەوە .
(٥) — لەم رووەو بۆ ئەم مەبەستە سوودوەرگرتنمان زۆر کەم بوو ، چونکە ، یەکەم تورکی نازانین‌و دووەمیش سەرچاوەیەکی دیکەو بە زمانێکی عەرەبی دەربارەی لەیلیٚومەجنوونی تورکی‌یەوە دەستم نەکەوت . جگە لەوەی کە لە ژمارەی دەی گۆڤاری «المستنصریه»دا نەبێ ، کە ئەویش بریتی‌یە لە زانیاری‌یەکی زۆر کەم‌و کورت .
لەو کۆڤارەدا . «المستنصریه» . ژمارە (د٥=١٠) . لە لاپەرە (٣٠٣)وە تا (٣١٥) بە ناوونیشانی «لیلیٚ‌والمجنون في الادب الترکي» لەلایەن «د. جوبان خضر»ەوە بڵاو کراوەتەوە .
وتاری ناوبراو ، وامان بە دەستەوە دەدات . کە شاعیرانی تورك : (کلشهری)و (عاشق پاشا) هەردووکیان چیرۆکی لەیلیٚومەجنوونیان بە دەستیانەوە گرتووە . بۆ ئەوەی چیرۆکی خۆشەویستی‌ی خودایی بە هۆیەوە دابرێژن ، کە ئەمەش خۆی لەخۆی‌دا بیرێکی سۆفیگەریەتی‌یە .
پاشان ، نووسەر ، پاش ئەوەی رازی لەیلیٚومەجنوونی ناو کتێبی «الاغانی» دەگێرێتەوە ، دێت ، بە سەردەمی ریزکردنی ئەو شاعیرانەوە ، کە رازی لەیلیٚو مەجنوونیان بە هۆنراوە هۆنیوەتەوەو ئەوانیش ئەمانەن :
(ادرنلی شاهدی ،؟ — ١٤٨٢) ، (احمد پاشاەم — ١٤٩٧) ، (علی شیر نوائی ، ١٤٤١ — ١٥٠١) ، (بهشتی احمد سنان) (حمدی حمدالله ، ١٤٤٩ — ١٥٠٣) ، (خلیل بدر الدین ،؟ — ١٥٣٠) ، (احمد رضوان) ، (فالح جلبی) ، (نجاتر ، ؟ — ١٥٠٨) ، (قدیمی) ، (خلیل حامدی زادە) ، (سیدائی) ، (خیالی عبد

الوهاب) ، (حقیری) ، (فضولی ، ؟ -- ١٥٥٦)و هەندێکی دیکەش .
(فضولی) ، بە گەورەترین شاعیری ئەو سەردەمەی تورك لە قەڵەم دەدرێت ئەم شاعیرە ناوی «محمد» کوری «سلیمان»ە مێژوونووس «عالی» ، وا دەری خستووە ، کە «فضولی» خەڵکی بەغدا بووە ، بەڵام «قنالی زادە» وای دەرخستووە ، کە (فضولی) خەڵکی (حلە) بووەو (ریاضی)یس دەیکات بە خەڵکی (کەربلا) .
دەربارەی مێژووی ژیانی (فضولی)یەوە ، زۆر کەم دەزانرێت ، بەڵام (عهدی) بەغدادیی ، وامان پێ دەڵێن ، کە (فضولی) لەساڵی (١٥٥٦) بە نەخۆشی تاعوون دەمرێتو بە تەنیشت مەشهەدی (حسین)ەوە ، لە کەربەلا نێرژاوە .
(فضولی) بۆ ماوەیەك ، لەعیراق‌دا ژیاوە . کە مەڵبەندی رۆشنبیریی‌ی عەرەبی‌و تورکی بووە . لە ئاخروئۆخری تەمەنی‌دا . رازی (لەیلی‌و مەجنوونی) هۆنیوەتەوەو بە
**هۆیەوە توانیویەتی وێنە سوفیەتی‌و سۆفیگەریەتی خۆی وێنە بگرێت .**
رازی لەیلی‌ومەجنوونی «فضولی» نزیکەی (٣٤٠٠) دێرە شیعری جووتەن .

(٦) -- وێنەی شانۆگەریە شیعریەکەی (لەیلی‌و مەجنوون)ی ئەحمەد شەوقی ، بە جوانترین‌و باشترین وێنەی رازی (لەیلی‌و مەجنوون)سەر ژمێر دەکرێت ، بە تایبەتی لە ئەدەبی نوی‌ی عارەبی‌دا . بە وێنەو بۆ مەبەستی بەراوردو دەرخستنی لایەنی عارەبی رەسەن‌و دەست نیشان کردنی لایەنی ناعارەبی ، کورتەی هێنراوەتەوە .
ئەحمەد شەوقی ، ساڵی (١٨٦٨) . لە زەمانی خدیوی ئیسماعیل‌دا لە خێزانێکی دوورەگ (باوك کوردو دایك تورك) لەدایك بووە (تەماشای -- تاریخ الادب العربي -- بکە) .
جگە لەوەش نەنکی باوکی شەرکەسی‌و نەنکی دایکیش یۆنانی بووە . خوێندنی سەرەتایی‌و هی ناوەندی ، تا تەمەنی پانزەساڵی) تەواو کردووە . ئەوجا چووەتە حقووقەوە . لە قوتابخانەی تەرجومە ئیجازەی وەرگرتووە ، ساڵی (١٨٨٧) بۆ خوێندن بۆ فەرەنسا چووە ئەم ناردنەش ، لەسەر ئەرکی خدیوی بووە بۆ ماوەی دوو ساڵێك لەوێ ماوەتەوە ، لەو ماوەیەدا ، سەری ئینگلتەرەی داوە . لەپاش دووساڵی ، ئەحمەدشەوقی بۆ ئەوەی لە نەخۆشی چاك بێتەوە ، بۆ جەزائیر چووەو بۆ

ماوەی مانگ‌ونیوێ لەوێ ماوەتەوە ئەنجا بۆ فەرەنسا گەڕاوەتەوەو ساڵی سێیەمی لە حقووقدا بەسەر بۆ فەرەنسا گەڕاوەتەوەو ساڵی سێیەمی لە حقووقدا بەسەر بردووە. پاش دەرچوونی ، بۆ ماوەی شەش مانگێکی دیکەش لە فەرەنسا ماوەتەوەو چی کون‌و قوژبن‌و مەڵبەندی ڕۆشنبیریی هەبووە ، هەمووی دیوە لەساڵی ۱۸۹۱ ، ئەحمەد شەوقی بۆ میسر گەڕاوەتەوە.

بەهۆی سەروەت‌و سامانی ئەو ژنەیەوە ، کە هێنابووی زۆر دەوڵەمەند بووە. جگە لەمەش شەوقی شاعیری (کۆشك) بووەو ناوبانگی بە (امیر الشعراء) دەر کردووە.

شەخسیەتێکی ئورستوقراتی هەبووە ، بەرهەمێکی ئەدەبی زۆری بەجێ ماوە. ساڵی ۱۹۳۲ کۆچی دوایی دەکات.

(۷) – شاعیرانی کورد ، لە هۆنینەوەی شیعری‌دڵداری‌یان‌دا ، باسی لەیلی‌و مەجنوونیان کردووەو وێنەی پاکی دڵداریی‌ی لەیلی‌و مەجنوون)یان خستووەتە ناو گۆرانی‌یەکانەوە. هی وەهاشیان هەیە ، کە بەوە وازی نەهێناوەو قەسیدەیەکی سەربە خۆی بۆ (لەیلی‌ومەجنوون) هۆنیوەتەوەو بەڵام لەو قەسیدەیەی‌دا دیمەنی وەهای پیشان داوە ، کە خۆی دیویەتی‌و بەدڵیەوە چووە.

سەیدی هەورامی ، کە لە بەراوردەکەدا ، دەستمان بۆ راکێشاوە ، بەو بۆنەیەوە ، قەسیدەیەکی پەنجاویەك دێڕی هۆنیوەتەوە. ئەو قەسیدەیەش ، بە ناوونیشانی (دڵەی شەیدای مەست)ەوەیە – (تەماشای ل ، ۸۷ – ی دیوانی سەیدی هەورامی. کاردۆخی – بکە).

(۸) – خوێنەر ئەگەر ویستی ، بۆ راستی راستەقینەی (وەلی‌و شەم) بگەڕێتەوە ، بۆی هەیە ، بۆ دوو سەر چاوەی ، کە لەو رووەوە بڵاوکراونەتەوە ، بگەڕێتەوە ، ئەوانیش : (وەلی دێوانە)ی عوسمان هەورامی‌و (ڕۆشنبیریی وەلی دێوانە)ی محەمەئەمین هەورامانی

(۹) – هەواڵی مەجنوون ، لە سەرچاوەی هەمە جۆرەوە هاتووە ، هەندێ لەو سەرچاوانە ، بەسەرچاوەی سەرەکی بۆ هەواڵی مەجنوون سەر ژمێر دەکرێن. هەندێکی دیکەشیان ، لە جۆرە ئاماژەیەك زیاتر ، چی دیکە نی‌یە !

سەرچاوەی هەرە سەرەکی ـ کە لە کۆنەوە بدەن ـ کتێبی (الشعر والشعراء)ی (ابن القتیبه)و کتێبی (الاغانی)ی (ابي الفرج)ن .

سەرچاوەی یەکەمیان ، هەر تەنها شێوەیەکی هەواڵگۆنەیی‌یە ، بێ ئەوەی پەنای بەر سەرچاوە بردبێت . بەڵام ئەوەی (ابی الفرج) پەنای بۆسەرچاوە بردووەو لێشی ورد بووەتەوەو لە سەنگی مەحەکی راستی‌و چەوتی داوە لەبەر ئەوە بە سەرچاوەیەکی کۆنی دەوڵەمەند دەزانرێت .

جگە لەمانەش ـ پشکێنەر ـ توانای ئەوەی هەیە ، کە هەواڵی مەجنوون ، لە چەند سەرچاوەیەکی دیکەدا بزانێت بۆ وێنە ـ وەك بەرهەمی (الزهره) ، شیعری مەجنوونی تیادا دەست دەکەون‌و پێشی ئەوانەی کتێبی ئەغانی‌و بە ماوەیەکی زۆریش ـ کۆ کراونەتەوە .

بەڵام (الاصمعی)یش ـ سەبارەت ـ بە مەجنوونەوە ـ وای لە قەڵەم دەدات ، کە دنیا هەرگیز پیاوی وەهای بە ناوی مەجنوونەوە هەبووبێت ، بە خۆیەوە نەدیوە .

لێرەدا مەبەستمان لەوەنی‌یە ـ کە مەجنوون بووە ، یاخود نەبووە ، بەڵکو مەبەستمان بیرورای جۆر بەجۆری سەرچاوەکانە ، دەربارەی مەجنوونەوە .

بە هەرحاڵ ـ پشکێنەر بۆی هەیە ـ ئەم سەرچاوانەی دەست بکەوێت :

(ا) – دیوانێك شیعر ، بە ناوی مەجنوونەوە ، نوسخەیەکی لە «بولاف» لە قاهرە لەچاپ دراوە . نوسخەی دەست نووسیش لە مەکتەبەکانی (ئەستەمبوول)و (کەمبرج)دا دەست دەکەون .

(ب) – هەمەجۆرا دەربارەی مەجنوونەوە لە کتێبی‌و دراسات فی تاریخ الادب العربي – منتخبات)دا ـ دەست دەکەویت .

(ج) – هەروەها ـ رازی مەجنوون (قیس بن الملوح العامری) سالی ١٨٦٨ لە بێرووت بڵاو کراوەتەوەو ساڵی ١٢٨٢ه لە (تاران)و لە ساڵی (١٢٩٧)ه بش لە بۆمبای بڵاو کراونەتەوە .

(د) – (جاحض)یش ـ سەبارەت بە مەجنوونەوە ـ وتوویەتی هەر پارچە شیعرێکی بێ خاوەن ـ دەست‌کەوت ، یەکسەر ناوی (قەیس)ی پێوە دەنوسێنرێ .

لە بەرهەمی (تاریخ الادب العربي)دا ، باسی (لیلی

الاخیلیه – (؟ – ٧٥/٦٩٥ی کۆچی) هاتووەو کورتەی بەم جۆرەیە لەیلیٚ ، کچی عەبدەوڵڵا کوری رەحاڵ لە هۆزی بەنی ئەخیلی عامرە . ئافرەتێکی زۆر جوان بووە . لەگفتو گۆدا ، زۆر رەوانو دیبلۆماسی بووە ، شیعری هۆنیوەتەوەو ئاگاداری سەرگۆزەشتەی باوباپیراتی عارەب هەبووە .

(تەوبە) ، کوری حیمیەر حەزی لیٚ کردووەو ئەمیش لە هۆزی عەقل – ی عامر بووەو حەزی لە لەیلیٚی ئەخیلی کردووەو شیعری پیادا هەڵداوە . تەوبە داوای دەکات ، بەلاٚم باوکی نایداتیٚ . پاش بەرپا بوونی چاوونامی حەزلیٚکردنی نێوانیان ، باوکی لەیلیٚ لەیلیٚ بە پیاوێکی دیکە بەشوو دەدات . ئەم مێردەی لەیلیٚ لە لەیلیٚ زۆر خانەگومان بوو ، بۆیە نەیدەهێشت ببینێت ، بەلاٚم (تەوبە) کۆڵی نەداوەو هەمیشە سەری لیٚ داوە .

بە هەرحالٚ ، (تەوبە) یەکێك بوو لەوانەی کە بەهۆی هێرش بردنە سەر هۆزی دیکە تالاٚنی دەکردو بەوە دەژیا . لە هێرشێك‌دا تەوبە دەکوژرێت . لەیلیٚ لەگەلٚ مێردەکەیدا بە لای گۆرەکەی (تەوبە)دا دەچن . لەیلیٚ دەچێتە سەرگۆرەکەی (تەوبە)و بە سواری حوشترەکەبەوە سلاٚوی لیٚ دەکات . پاشان لەیلیٚ روو دەکات مێردەکەی ئەوانەی ، کە لەگەڵیاندا دەبنو پیٚ دەکەنیٚو دەڵێت : (تا ئێستە درۆی وەهام نەبیستووە ؟) ئەوانیش وتیان چۆن ؟ لەیلیٚ – ش وتی ، ئایا ئەمە وتەی تەوبە نییە ، دەڵێت :

«ولو ان ليلى الاخيلية سلمت علي ودوني تربة وصفائح

لسلمت تسليم البشاشة او زقا اليها صدى من جانب القبر صائح»

ئەوجا ، لەگەرانەوەدا کونەبەبوویەك لەکونێك‌دا لەنزیك گۆری (تەوبە)وە دەرچوو ، حوشتری لەیلیٚ هەڵیوەشاندو لەیلیٚ کەوتە خوارەوەو مردو لەویٚ بەنزیکی ئەوەو ناشتیان .

(١٢) – ئەوە ی کە دەربارەی ژیانی نظامی بەوەبزانرێت ئەوەیە ، کە سالی (١١٤١ – ١٢٠٣) ژیاوەومردووە . ناوی (ئەلیاس)و کونیەی (ابو محمد)ە بەلاٚم نازناوی بە (نظامی)یەوە دەرکردووە ناوی باوکی (یوسف) کوری (زەکی)یە لەشاری «گەنجە» کە حاڵی حازر کەوتووەتە ناوچەی قوقاز(ئەلیزابێث پۆل)ەوە (نظامی) لەساڵی (٥٣٥)ی کۆچی ، لەدایك بووە لەساڵی (٥٩٩)ی کۆچی کۆچی دوایی

کردووه بەمنداڵی باوکی مردووه ئەوەندەش پێ نەچووە دایکیش مردووه ئەوجا خاڵەکانی دەیگرنە لای خۆیو پێ‌ی دەگەیەنن خۆی وا دانی پیادا ناوه ، کە دایکی کچی میرێکی کورد بووه .

دەرسی سوفیگەریەتیو ئەدەبیش کاریگەر بووه لێ‌یو ئەمەش لەبەرهەکانی دا بە تەواوی رەنگی داوەتەوه .

بەرهەکانی بە (پێنج گەنجە) (واتە : پێنج خەزێنە) . ناوبانگیان دەر کردووه .

دەست‌پێشخەری کردن . بۆ گوێزانەوەی رازی لەیلێ‌و مەجنوون بۆ ناو ئەدەبی فارس ، بۆ گەنجەوی دەگەرێتەوه . زوربەی زۆری شاعیرەکانی دیکەی فارس ئەو سەردەمە شوێنکەوتووی ئەون .

سەرچاوەکان :

- الرواية الشعرية ليلى ومجنون في الادب الكردي – الدكتور معروف خزاندار – مجلة كلية الاداب . العدد (٢٠) ، ١٩٧٦ .
- مجنون ليلى محمد علي الجمعة مكتبة الشروق بغداد ١٩٨٣ .
- تاريخ الادب العربي حنافا خورى الطبعة السادسة لبنان .
- الحياة العاطفية بين العذرية والصوفية الدكتور محمد غنيمى هلال ، قاهرة ، ١٩٦١ .
- الادب المقارن – الدكتور محمد غنيمى هلال – دار العودة – بيروت .
- نظامى گنجوى ليلى ومجنون – ادارة انتشارات دانس موسكۆ سنة ١٩٦٥ .
- مجلة كلية الاداب «المستنصرية» ج – ١٠ .

سەرچاوەی کوردیی

- لەیلێ‌ومەجنوون . لێکۆڵینەوەوپشکنینی م . هەورامانی .
- (عبد الجبار) ئاغا کانی لەیلێ‌ومەجنوون ، ئەربیل – ١٩٦٩
- عەلی‌کەمال باپیر – لەیلێ‌و مەجنوون ، بەغدا – ١٩٥٠
- مەلا فەرەجی صالح شەکیب – لەیلێ‌و مەجنوون ، بەغدا – ١٩٦٩
- دیوانی سەیری هەورامی – کۆکردنەوەی کاردۆخی
- هەندێ بەرهەمی دیکەی کوردیی‌و عارەبی کە لە پەراوێزەکاندا ناویان هاتووه .

# برتۆڵد بریشت کێ بوو ؟ چی کرد ؟

صلاح حسن پاڵەوان

ئویجن برتولت فریدریش برشت لە « ١٠ »ی شوباتی ساڵی ١٨٩٨ لە دایك بووە ، هەر لە سەرەتای دەست پێکردنی ژیانی هونەری‌یەوە ، نازناوی « برت برشت »ی بۆ خۆی هەڵبژارد ، بەلام لە دواییدا بۆ یەکجاری نازناوی برتولت برشتی هەڵگرت .

باوکی بەڕێوەبەری کارگەی دروست کردنی کاغەز بوو ، دایکیشی لە خێزانێکی وردە بۆرژوا بوو ... ساڵی ١٩٠٤ چووە قوتابخانەی میللی سەرەتایی ، لە ساڵی ١٩٠٨ گوێزایەوە قوتابخانەی مەلیکیەت هەتا ساڵی ١٩١٧ بڕوانامەی ئامادەیی وەرگرت .

ساڵێك پێش وەرگرتنی بڕوانامەی لە شاری دایکی‌یەوە « واتە نکسبورگ » گواستی‌یەوە بۆ مۆنێخ ، چەنە ساڵێکی بە هات و چۆ لە نێوان ئەم شارە بە سەر برد .

لە ساڵی ١٩١٨ دا هۆنراوە مەزنەکەی بە ناوی « داستانی سەربازی مردوو » نوسیوە ... هەر لە هەمان ساڵدا بەشی یەکەمی شانۆگەری « مێرد »ی نوسیوە ، لەو ساڵەوە بەردەوام بووە لە خوێندنی پزیشکی ...

هەر لەو ماوەیەدا ئاشنایەتی لەگەڵ زۆربەی نوسەر و ئەدیبەکانی هاوچەرخی خۆی پەیدا کردووە ، هەر لەو ساڵدا شانۆنامەی « سپار تاکۆس »ی نوسیوە .

لە « ١ »ی ئایاری ساڵی ١٩٢٠ باوکی کۆچی دوایی کردوە ...، لە ساڵی ١٩٢٢ « ماریانە تشۆف » کە ئەکتەرێکی شانۆیی بوو ، مارە ئەکا و ئەبێتە هاوسەری ژیانی .

برشت چەند مانگێك لە بەرەی جەنگی نازی‌یەکان بووە ، بێ گومان جەنگ وکاریگەری جەنگ لە بەرهەمەکانی برشت ڕەنگی داوەتەوە ووای لێ کردووە بە نێو قولایی کێشەکانی کۆمەڵدا شۆڕ بێتەوە .

« لە ساڵانی جەنگی نازی‌یەکان دژی وڵاتانی دراوسێ » هەڵوێستی برشت لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر گۆڕا ... واتە لە قۆناغی لایەنگیری کردنی جەنگ بۆ قۆناغی هەڵوێستی دژ بە جەنگ ، چونکە بارو دۆخی ئەو کاتەی کە برشتی تیا دەژیا بارو دوخێکی ئاڵۆزاو بوو . بە چاوی خۆی دەیبینی واخەریکە کۆمەڵگا بەرەو شێوان و داتەپێنن ئەچێ بۆیە وەك شاعیرێ هەستی دەکرد ئەرکی مێژوویی بەرامبەر ئەو ڕووداو و گۆڕانکاری‌یانە لە سەرە .

لەو ماوەیەی کە لە بەرەی جەنگی نازی‌یەکان بوو ... جەنگ کارێکی گەورەی لە ژیانی برشت کرد ، ئەم کاریگەری‌یەش لە کارە هونەری و ئەدەبی‌یەکانیدا بە ڕوونی دەرکەوت . جەنگ لە بەرهەمەکانی برشت دا وەك میردە زمەیەکی ترسناك خۆی ئەبینی ، جەنگی وەك هێمایەك بۆ تاریکی و دژواری بەکار هێناو ... کاریگەری جەنگ زیاتر هانی دەدا لە کێشە جۆر بە جۆرەکانی کۆمەڵ بکۆڵێتەوە .

برشت له شانۆگه‌ری « برایانی هۆراس و برایانی کۆریاس » به ڕوونی و به شێوه‌یه‌کی دیالکتیکیانه کێشه‌ی نێوان ڕاستی و ناڕاستی ، چاك و خراپ ده‌رئه‌خا ... له‌م شانۆنامه‌یه‌دا په‌نای بۆ خه‌زێنه‌ی کلاسیکی بردووه ، هه‌ڵبژاردنی ئه‌و بابه‌ته ناو و ناووازه و هێزێکی له ڕاده به ده‌ری پێ به‌خشی به‌ڵام له‌م شانۆگه‌ری‌یه‌دا برشت هه‌موو بیر و بیرۆکه ڕابردووه‌کانی سه‌ره‌وخوار کردۆته‌وه و چیرۆکه‌که‌ی به‌و شێوه‌یه ڕاقه کردووه که‌وا کۆریاسه‌کان له پێناوی دزی و قوڵبڕین جه‌رده‌یی ده‌که‌ن و ده‌نا له پێناوی مه‌سه‌له‌یه‌کی نیشتمان خه‌بات ناکه‌ن .

له سه‌ره‌تادا هه‌ندێك به ڕاسته‌وخۆیی کۆریاسه دزه‌کان په‌یام بۆ یه‌کتر ده‌نێرن و داوا له یه‌کتری ئه‌که‌ن که‌وا کێشه ناو خۆیی‌یه‌کانی خۆیان نه‌هێڵی و یه‌ك بگرن . بێگومان له پێناوی کێشه‌ی چینایه‌تی ئه‌م په‌یامه‌شیان بۆ ئه‌وه‌یه که هێرش بۆ سه‌ر دراوسێ‌کانیان بکه‌ن بۆ ڕووت کردنه‌وه‌یان . به‌و جۆره « هاوار ده‌که‌ن و داوا له هۆریاسه‌کان ده‌که‌ن » .

« سه‌ر دانه‌وێنن
واز له شمه‌ك و کێڵگه و کارگه‌ی ئاسنینتان بێنن !
گه‌ر وا نه‌که‌ن
به هێزی سه‌ربازی
به جۆرێ نوقومتان ئه‌که‌ین
که‌ستان له ده‌ستمان ڕزگارتان نه‌بێ » .

که‌واته ئه‌وه‌یه هۆی جه‌نگ ، دوای چه‌ند ساڵێکی تر نازی‌یه‌کان به‌م کاره هه‌ڵده‌ستن « برشت وای پیشان ئه‌دا » به‌ڵام کاردانه‌وه و به‌رپه‌چ دانه‌وه‌ی گه‌لان ، ڕێگه‌ی ئه‌م ده‌ست درێژی‌یه ئه‌گرێ .

برشت بۆ ئەم ڕوو بەڕوو بونەوەیە بەڵگەی هەستیاری ئەدا بە دەستەوە . بەرگری کردن لە نیشتمان بیرێکی خەیاڵی و عاتیفی نی یە وەك زەوی و نەمری و کەلەپوور بەڵکو بەرگری بە پلەی یەکەم لە « ڕاگریریەکان »ی « قوام » ژیان هۆراسی یەکان بە گاڵتە پێکردنەوە وەلامیان دانەوە .

« وا چەند چەتەیەك
ئەیانەوێ بە هێزێکی قەبە
وڵاتمان گەمارۆدەن ،
بەڕاستی ئەیانەوێ ژیانمان تاڵ کەن
گەر هەرچی گرنگی ژیانە پیمان دان
بۆچی لە مردن بترسین ؟ »

ئەمەش دیاردەیەکی سەیر ئەدا بە دەستەوە لایەنێك خاوەنی هێزە بەلام دەستدرێژکەرە ، لایەنەکەی تر کەم هێزە بەلام خاوەن بڕوایەوە بەرگری کەرە . برشت ئەم مەسەلە مێژوویی یەی زۆر بە وردی و هوشیارانە بەستوە بە ژیانی هاوچەرخەوە ، ئەبینین لە ئەنجامدا کێشە و ئاژاوە وەك نەخۆشی یەکی کوشندە هێزە چەوسێنەرە کە دائەپلۆسێنی .

بەرهەمە هونەری و ئەدەبی یەکانی برشت وەك مەسەلەیەکی زیندوو گیروگرفتەکان ئەخاتە ڕوو لە مەسەلەی تاکە کەسایەتی دەر ئەچێ و ڕوو ئەکاتە کۆمەڵ .

بەرهەمی هونەری برشت شانۆکانی یەتی کە هەر یەکەیان هەڵێنجراوی واقیعی ژیانن چونکە برشت شاعیر و هونەر مەندێکی خاوەن هەڵوێست و چاونەترس و تێکۆشەر بوو ، بڕوای بە گۆڕان و گەشەکردن

هەبوو ، بڕوای بەو ڕاستی‌یە هەبوو کەوا مرۆڤ بە گشتی بە شێوەیەکی پاك و پاراو لە دایك ئەبن .

بەلام لەگەڵ گەشە کردن و پێگەیشتنیان ڕەوشتی خراپ و چاکیان لا دروست دەبێ ، ئەوەشیان لە کۆمەڵەوە فێر دەبن . هەروەها لەگەڵ گەشە کردنیان ڕەنگدانەوەی کارەکانیان بە سەر کۆمەڵگادا دەر ئەکەوێ .

بۆ نمونە شاعیر کە ئەیەوێ خراپ کارەکانی کۆمەڵ ڕیسوا بکا ڕوو ئەکاتە کارەکانیان و نەفرەتیان لێ ئەکا . تاقە هیوای بـرشت لە ژیانـدا سەررکەوتنی مرۆڤ بووە ، هەمیشە هەوڵی ئەوەی داوە حەقیقەتی مرۆڤ بزانێ ، بەلام مرۆڤەکانی ئەو لەو قۆناغەدا مرۆڤگەلێکی یاخین ، پـوچ و خۆشگوزەران و سیفەت ئاژەڵن .

برشت بڕوای بە پەیامی مێژوویی هونەرمەند و شـاعیر و نـوسەر هەبوو ... لە وتاری « پێنج گیروگرفتی نوسەر » نوسەر و شـاعیرەکـان ئاگادار ئەکاتەوە کە ئەبێ ئاگایان لە کارە ترسناکەکانیان بێ ، هەر هەمان ئاگاداریش لە پارچە شیعری « قۆناغی تاریکی »دا دوبارە دەکاتەوە .

هەر وەها ئاگاداریان ئەکاتەوە کە پیاهەڵدانی درەخت و گوڵ و گیا ، لەم قۆناغە ڕەشەدا تاوانە ، ڕوویان تێ ئەکا و دەڵێ : « ئایا ئەبێ بەرامبەر ئەم هەموو کوشتن و بڕین و خوێن ڕشتنە بێدەنـگ بن و ڕوو بکەنـە پیا-
-هەڵدانی جوانی و سروشت و دیمەن ؟

ئایا مەسەلەیەکی تر نی‌یـە هونـەرمەنـد لە سەری بـدوێ ؟ ئایـا هونەرمەمەند و شاعیر و نوسەر ئەرکی وریا کردنەوەی کومەڵیان لە سەر نی‌یـە ؟ ئایـا نابێ لە بـەرامبەر ئـەو هـەمـوو فـرو فێـڵ و قـوڵبـڕین و هەڵخەڵەتاندنانەی کە بەرامبـەر بە خـەڵکی ئەکـرێ شتێك بڵێن و ڕووی ڕاستی‌یان ئاشکرا بکرێ ؟ » .

برشت بەم پرسیارانە ڕووی دەمی لە شاعیر و نوسەر و هونەرمەندان دەکا و داوای وەڵام دانەوەیان لێ دەکات .

برشت مێشکی بە دیدەیەکی شۆڕشگێڕانــە و ڕوونکردنــەوەیەکی سادە و دڵگیر مێشکی خەڵکی کردەوە و پەردەی لە ڕووی تاوانەکانی نازیزم هەڵدایەوە ... خەباتێکی توند و تیژ دژ بە هیتلەر و هاوەڵەکانی بەرپا کرد ، لە ئەنجام دا ناچار بوو وڵاتی دایکی بە جێ بهێڵێ .

لە پارچە شیعری « ئەڵمانی ١٩٣٣ »دا نیشتمانەکەی وەك دایکێکی « ڕەنگ گۆڕاو » وەسف ئەکا .

* * *

شوێنی برشت لە مێــژووی هونــەر و ئەدەب دا شــوێنێکی دیار و مەزنە ، لە ڕیزی هەرە پێشەوەی هونەرمەند و ئەدیبە مەزنەکانە ... برشت نەك تەنیا ڕاستی خۆش ویستووە بەڵکو خەباتیشی لە پێناودا کردووە ، ئەم ڕاستی‌یەش لە کارە شانۆیی‌یەکانی‌دا دەر ئەکەوێ ، وە نەبێ برشت لە یەك مەیدانا ئەسپی خۆی تاو دابێ بەڵکو لە مەیدانەکانی تریشدا شۆڕە سوار بووە ، ئەکتەری شانۆیی و سینەمایی بوو ، شارەزای تەواویشی لە فەلسەفە هەبووە .

* * *

ئەمەش هەندێکە لە کارە هونەری‌یەکانی و ئەدەبی‌یەکانی :

ـــ نوسینی شانۆگەری « مێرد » لە ساڵی ١٩١٨ .

ـــ نوسینی شانۆگەری « سپارتاکۆس » لە ساڵی ١٩١٩ .

ـــ شانۆگەری « ژیانی ئەدواری دووەم » لە ١٩٢٤ لە چاپ داوە .

ـــ لە ساڵی « ١٩٢٧ » شانۆگەری « کلکوتا »ی نوسیوە .

ـــ « کۆمەڵە شیعری گیرفان » .

ـــ کۆمەڵە شیعری « ماڵەوە »ی لە ساڵی ١٩٢٧ بە چاپ گەیاندووە .
ـــ هەر لە هەمان ساڵدا واتە لە ١٩٢٧ دا شانۆگەری « ستران »ی بە ناوی « مهاجونی » لە زنجیرە پەرتووکی « یونیفرسال » بڵاوکردۆتەوە .
ـــ لە بەرلین دا دوو شانۆ نامەی برشت بە ناوی « لە جەنگەڵی شاردا » و « پیاو بە پیاو » لە چاپ ئەدرێ .
ـــ لە ساڵی ١٩٣٠ تا ساڵی ١٩٥٥ ، چواردە بەشی پەرتوکی « هەوڵدانەکانی » گەیاندە چاپ ، ئەم پەرتوکە لە هەموو بابەتێکی تێدایە ، هەروەها گرنگی بە لایەنی تیۆری کاری شانۆیی داوە ، کارێکی مەزنی هونەرمەندانەیە .
ـــ لە ساڵی ١٩٣٠ دوو شانۆگەری یەکەمیان بە ناوی « ئۆپرای سێ قروش » و دووەمیان بە ناوی « گەشە کردن و تێکچونی شاری مەهاگونی » بە چاپ گەیاند .
ـــ لە ١٩٣١/١٢/٢١ لە شانۆی « ام شیفباوردام » پیشاندانێکی گەورە بوو لە دەرهێنانی برشت خۆی و نییر .
ـــ لە ساڵی ١٩٣٤ « برایانی هۆراس و برایانی کوریاس »ی بە چاپ گەیاند .
ئەمانە و چەندەها کاری مەزنتر وەك « ژیانی گالیلی » و « بۆنتیلا و ماتی » و « مرۆڤی دڵپاك » و چەندەها نامیلکەی لە سەر کاری شانۆیی نوسیوە .

* * *

## پارچەی ( ١ )

## لە سەر دیوار نووسرابوو

بە تەباشیر
لە ڕووی دیوارێك نووسراوە
« ئەوان شەڕ خوازن »
ئەو کەسا       ەی نوسیوە ..
وا ئێستا
لە مەیداذ       هەڵهاتووە .

## پارچەی ( ٢ )

## ژنێکی میهرەبانم هەبوو

ژنێکی میهرەبانم هەبوو
چاکترین ژنی دنیا بوو ،
ڕۆژێ فەرماندەیەکی سەربازی
هات و فەرمانی پێ کردم !

* * *

لەوێدا من بەرگریم لە مەبەست ئەکرد
ژنەکەشم ...
لەگەڵ کەسانێکی تر ئەڕۆیشت

ئەم کارەش بێ شەرمی بوو بۆ من
ئەو پەڕی بێ شەرمی

* * *

زەبر و زەنگی پیشان ئەدەم
ئەکێشم بە ناو دەمیا
ناشتوانێ هیچ بکا
بەڵام کاتێ کە فەرماندەکەم ببینم
لە ترسانا
هیچم نایەتەوە هانا
هەر دوور نییە خۆشم پیس کەم

* * *

بێ مێشک نەبووم
بەڵام بۆ تەنیا جارێك
بیرم لێ کردەوە
ڕەنگە هەندێ شتی بۆ من ئاڵۆز بێ
لە توانای مندا نەبێ
یا ڕەنگە جەنگێ بەرپا کەم

* * *

بە فەرماندەی سوپاکەم ووت
تۆ چەکێکت بە من داوە
بۆیە ئێستا نیشانەکەم لە خۆت ئەگرم

## پارچەی ( ٣ )
## هیوا خوازەکان

هیواتان بە چی‌یە ؟
هیواتان بەوەیە تەماشاکەران
گوێ لە وتەکانی ئێوە بگرن ؟
چاو چنۆکەکان ..
شتێکتان پێ ببەخشن ؟
یان گورگەکان لە جێی لەت و پەت کردنتان
خواردنتان دەرخوارددەن ؟
یا پڵنگە دڕندەکان
بە میهرەبانی‌یەوە ، ڕێگاتان بدەن
ددانەکانیان بکێشنەوە
هیواتان بەمانەیە ؟

## پارچەی ( ٤ )
## پرسیاری کرێکارێك لەگەڵ خوێندنەوە

شاری حەوت دەرگای « تەب » کێ بنیاتی نا ؟
لە پەرتووکەکان ، ناوی فارماندەکان هاتوو
ئایا فەرماندەکان ،
هیچ پارچە بەردێکیان بە کوڵ کێشا ؟
بابل کە چەند بار و چەند جار وێران بوو ،

هەر جارە کێ دروستی ئەکردەوە ؟
دروست کەرانی شاری زێڕینی « لیّما » .
لە کام خانوودا ، خۆیان ژیان بە سەر ئەبەن ؟
ئەو شەوەی کە دیواری گەورەی چین
تەواو کرا ،
وەستایانی ئەو کارە بۆ کوێ ڕۆیشتن
ڕۆمای گەورە
پڕ لە تاقی سەرکەوتنە
کێ ئەو هەموو تاقانەی نایە پاوە ؟
قەیسەرەکان بە سەر چ کەسێکا سەرکەوتن ؟
ئایا بێزەنتی سەر زاری خەلّکی
تەنها کۆشك نەبوو ، بۆ دانیشتوانی ؟
لە ئەتلانتی ئەفسانەیی
ئەو شەوەی کە دەریا لووشی دا
ئایا نقوم بوەکان ، لە سەر بەردەکانی خۆیان
هاواریان ئەکرد ؟
کۆیلەکان ..
دیللەکان ... بێنە هانامان
ئایا ئەسکەندەری لاو ،
بە تەنها خۆی توانی
هیندستان بگرێ ؟
« قەیسەر » کە هەموو « گالی‌یەکان » سەرتاپا شکان
تەنانەت چێشتکەرێکیش لە دووی نەبوو ؟
« فیلیپی » ئیسپانی‌یەکان ..

لە کاتێکدا کەشتی‌یە جەنگی‌یەکەی
نوقمی ئاو بوو ، لە خۆی زیاتر
ئایا کەسی تر گریا ؟
« فردریکی دووەم » لە جەنگەکانی
حەوتساڵەدا سەر کەوت ،
ئایا لەم سەرکەوتنەدا ،
کەس دەوری نەبوو ؟
لە ڕووی هەر پەڕەیە ، سەرکەوتنێ هەیە
کێ ئاهەنگی ئەم مەزنی‌یە ، ئەنوێنێ ؟
هەر دە ساڵ جارێ
مرۆڤێکی مەزن دێتە گۆڕێ
کێ‌یە ئەم مرۆڤە دەخولقێنێ ؟
ئەمە هەمووی حیکایەتە
ئەمە هەمووی پرسیارە

تەنانەت ئاسمان !
دیسان ئاسمان ئەیەوێ
بتەقێتەوە ..
ئەو کاتە ئەستێرەکان ئەڕژێنە
سەر زەمین
ئێمە و هەموو زەوی
بەرد باران ئەکا
ڕەنگە ئەم تەقینەوەیە
مژدەی سبەینێ بێ .

# وێنەیەك و
# پێنج شاعر

● احمد تاقانە ●

پێشەکییەکی کورت:

لە داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا ، باسی لەیەکچوون و لەیەك وەرگرتن و کارلێکردن ، کێشەیەکی نەبڕاوەی هەیە ... باسێکی وەها پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ووردو فراوان و بەربلاوو نموونە هێنانەوە هەیە .. کە من لێرەدا نامەوێت بچمە ناو ئەم باسە ئاڵۆزەوە ئەگەر ئەوە بە بەرچاوەوە بگرین کە لە بەرهەمی ئەدەبی جیهانیدا لەیەك وەرگرتن و لەیەکچوون و شتی دی زۆرە .. بێگومان نموونەش زۆرەو خوێندەوارە بەڕێزەکان ئاگایان ، هەر هیچ نەبێت ، لەچەند بابەتێکی ئەم جۆرە هەیەو .. ئەمە تەنانەت لەلای ئەدیبە بەرزەکانیشدا بەرچاو دەکەوێت .. ئەگەر ئەمە بە بەرچاوەوە بگرین ، باری باسەکە بەلایەکی دیدا دەشکێتەوە .

ئەمەش نابێت ببێت بەبیانوو هەموو کەسێك ڕێ بەخۆی بدات و بەکاڵ و کرچی و نەزانانە لەم لاولەولا شت بقۆزێتەوەو بیکات بەماڵی خۆی و ، کە یەخەی گیرا .. بڵێت : ئەدی بۆ فلان بافیسار، کە کەڵە ئەدیبی جیهانین و شتیان لە خەڵك وەرگرتووە.

نامەوێت درێژە بەم پێشەکییە بدەم بەڵام بەبڕوای من دەبێت لەلێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە بابەتەدا (بەپێی توانا) ، دوو خاڵ دەستنیشان بکرێت.

یەکەم : دەبێت ئەوە تۆمار بکرێت کە کام بەرهەمهێنیان بەر لەوانی دی پەیی بەو بابەتە بردووەو بناغەکەی دارشتووە.

دووەم : باسی ئەوەبکرێت کە هەریەکە و ئەو بابەتەی چۆن وەگرتووە بە چ جۆرێك هەڵس و کەوتی ئەدیبانەی لەگەڵدا کردووە .

من لێرەدا دەمەوێت هەوڵی ئەوە بدەم کە بەراوردێکی بەرهەمی شیعریی چەند شاعیرێك بکەم کە بەسێ زمان شیعریان گوتووەو هەمووشیان ـ لەو شیعرانەیاندا کە هەڵبژاردووین ـ

وێنەیەکیان بەکارهێناوە ، بەڵام هەر شاعیرەو بەجۆرێکی جودا لەوانیدی وێنەکەی سوود لێوەرگرتووە.

وێنەکە ، تەرازوویەکە تایەکی لەبەرسەنگینی هاتووەتە خوارەوەو نزمبووەتەوەو نیشتووەتە سەرزەوی‌و ، تایەکیی دیی لەبەر سووکی سەری کردووەو بەرز بووەتەوەو بە ئاسماندا چووەو ئەم شاعیرانە ، هەریەکەیان شتێکی .. یان ڕاستتر دووشتی بە دووتای ئەم تەرازووە چوواندووە .

یەکەم شاعیرو کۆنترینی ئەم شاعیرانە (مەنووچیهری) یە (أبو النجم أحمد بن قوص بن احمد المنوچهری) .. کەتا ، یان تا پاش ساڵی ١٠٤١ ی ز - ٤٣٣ ی هـ - ژیاوە.[1] لەدێڕی سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەمی سەرەتای ئەو چامەیەیدا کە بەیارەکەیدا هەڵیداوە دەڵێت :

| | |
|---|---|
| نماز شام نزدیك است و امشب | مەو خورشیدرا بینم مقابل |
| ولیکن ماه داره قصد بالا | فروشد آفتاب ازکوه بابل |
| چنان دو کفه سیمین ترازو | که این کفه شود زان کفه مایل[2] |

واتە : نوێژی شێوان نزیکەو ئەم شەو ، دەبینم وا مانگ‌و خۆر بەرامبەر یەکیان گرتووە ، بەڵام مانگ نیازی بەرزبوونەوەو سەرکەوتنی هەیەو خۆریش لە کێوی بابلەوە بەرەو ئاوابوون‌و دابەزین دەچێت ، وەکوو دووتای تەرازوویەکی زیوین کە ئەم تایەیان لەو تایەیان لاسەنگ ببێتەوە وایە .

لێرەدا دەبینین (مەنوچیهری) وەکوو سەرەتایەکی ڕۆمانسی ئامێو باسی سروشت دەکات‌و وورده وورده خۆی ئامادە دەکات بۆ بەیاردا هەڵگوتن‌و باسی خۆراوابوون‌و هەڵهاتنی مانگ دەکات‌و بە دووتای تەرازاوویان دەشوبهێنێت .

شاعیری دووەم ئەو شاعیرەیە کە (براون) تاکە دێڕێکی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا ڕۆکردووەتەوە[3] ، بێ‌ئەوەی باسی شاعیرو ناوو بەسەرهاتی بکات . تاکە دێڕەکەش ئەمەیەکە دەڵێت :

حسن ماەرا باتو سنجیدم بمیزان قیاس

بلەمە بر فلك شد ، وتو ماندی برزمین

واتە : شاعیر لێرەدا بە یارەکەی دەڵێت .. جوانیی مانگم لەگەڵ تۆدا لە تەرازووی پێوانەدا کێشانەکرد ، پلەی مانگ بە ئاسماندا چوو ، تۆ لە زەویدا مایتەوە .

# وێنەیەك و پێنج شاعر

● احمد تاقانە ●

پێشەکییەکی کورت:

لە داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا ، باسی لەیەکچوون و لەیەك وەرگرتن و کارلێکردن ، کێشەیەکی نەبڕاوەی هەیە ،.. باسێکی وەها پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ووردو فراوان و بەربڵاوو نموونە هێنانەوە هەیە .. کە من لێرەدا نامەوێت بچمە ناو ئەم باسە ئاڵۆزەوە ئەگەر ئەوە بە بەرچاوەوە بگرین کە لە بەرهەمی ئەدەبی جیهانیدا لەیەك وەرگرتن و لەیەکچوون و شتی دی زۆرە .. بێگومان نموونەش زۆرەو خوێندەوارە بەڕێزەکان ئاگایان ، هەر هیچ نەبێت ، لەچەند بابەتێکی ئەم جۆرە هەیەو .. ئەمە تەنانەت لەلای ئەدیبە بەرزەکانیشدا بەرچاو دەکەوێت .. ئەگەر ئەمە بە بەرچاوەوە بگرین ، باری باسەکە بەلایەکی دیدا دەشکێتەوە .

ئەمەش نابێت ببێت بەبیانوو هەموو کەسێك ڕێ بەخۆی بدات و بەکاڵ و کرچی و نەزانانە لەم لاولەولا شت بقۆزێتەوەو بیکات بەماڵی خۆی و ، کە یەخەی گیرا .. بڵێت : ئەدی بۆ فلان بافیسار، کە کەڵە ئەدیبی جیهانین و شتیان لە خەڵك وەرگرتووە.

نامەوێت درێژە بەم پێشەکییە بدەم بەڵام بەبڕوای من دەبێت لەلێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە بابەتەدا (بەپێی توانا) ، دوو خاڵ دەستنیشان بکرێت.

یەکەم : دەبێت ئەوە تۆمار بکرێت کە کام بەرهەمهێنیان بەر لەوانی دی پەیی بەو بابەتە بردووەو بناغەکەی داڕشتووە.

دووەم : باسی ئەوەبکرێت کە هەریەکەو ئەو بابەتەی چۆن وەگرتووە بە چ جۆرێك هەڵس و کەوتی ئەدیبانەی لەگەڵدا کردووە .

من لێرەدا دەمەوێت هەوڵی ئەوە بدەم کە بەراوردێکی بەرهەمی شیعریی چەند شاعیرێك بکەم کە بەسێ زمان شیعریان گوتووەو هەمووشیان ـ لەو شیعرانەیاندا کە هەڵبژاردوون ـ

وێنەیەکیان بەکارهێناوە ، بەڵام هەر شاعیرەو بەجۆرێکی جودا لەوانی‌دی وێنەکەی سوود لێوەرگرتووە.

وێنەکە ، تەرازوویەکە تایەکی لەبەر سەنگینی هاتووەتە خوارەوەو نزم بووەتەوەو نیشتووەتە سەرزەوی‌و ، تایەکی‌ی دیی لەبەر سووکی سەری کردووەو بەرز بووەتەوەو بە ئاسماندا چووەو ئەم شاعیرانە ، هەریەکەیان شتێکی .. یان ڕاستتر دووشتی بە دووتای ئەم تەرازووە چوواندووە .

یەکەم شاعیرو کۆنترینی ئەم شاعیرانە (مەنووچیهری) یە (أبو النجم أحمد بن قوص بن أحمد المنوچهری) .. کەتا ، یان تا پاش ساڵی ١٠٤١ ی ز ـ ٤٣٣ ی هـ ـ ژیاوە.[1] لەدێڕی سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەمی سەرەتای ئەو چامەیەیدا کە بەیارەکەیدا هەڵیداوە دەڵێت :

| | |
|---|---|
| نماز شام نزدیك است و امشب | مەو خورشیدرا بینم مقابل |
| ولیکن ماه داره قصد بالا | فروشد آفتاب ازکوه بابل |
| چنان دو کفه سیمین ترازو | که این کفه شود زان کفه مایل[2] |

واتە : نوێژی شێوان نزیکەو ئەم شەو ، دەبینم وا مانگ‌و خۆر بەرامبەر یەکیان گرتووە ، بەڵام مانگ نیازی بەرزبوونەوەو سەرکەوتنی هەیەو خۆریش لە کێوی بابلەوە بەرەو ئاوابوون‌و دابەزین دەچێت ، وەکوو دووتای تەرازوویەکی زیوین کە ئەم تایەیان لەو تایەیان لاسەنگ ببێتەوە وایە .

لێرەدا دەبینین (مەنوچیهری) وەکوو سەرەتایەکی ڕۆمانسی ئامێو باسی سروشت دەکات‌و وورده وورده خۆی ئامادە دەکات بۆ بەیاردا هەڵکوتن‌و باسی خۆراوابوون‌و هەڵهاتنی مانگ دەکات‌و بە دووتای تەرازاوویان دەشوبهێنێت .

شاعیری دووەم ئەو شاعیرەیە کە (براون) تاکە دێڕێکی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا ڕۆکردووەتەوە[3] ، بێ‌ئەوەی باسی شاعیرو ناوو بەسەرهاتی بکات . تاکە دێڕەکەش ئەمەیەکە دەڵێت :

حسن ماەرا باتو سنجیدم بمیزان قیاس

پلەمه بر فلك شد ، وتو ماندی برزمین

واتە : شاعیر لێرەدا بە یارەکەی دەڵێت .. جوانیی مانگم لەگەڵ تۆدا لە تەرازووی پێوانەدا کێشانەکرد ، پلەی مانگ بە ئاسماندا چوو ، تۆ لە زەویدا مایتەوە .

# وێنەیەك و پێنج شاعر

● احمد تاقانە ●

پێشەکییەکی کورت:

لە داهێنـانی ئەدەبی و هـونەریـدا ، باسی لەیـەکچوون و لەیـەك‌وەرگرتن و کـارلێکردن ، کێشەیەکی نەبڕاوەی هەیە ،.. باسێکی وەها پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ووردو فراوان و بەربلاوو نموونە هێنانەوە هەیە .. کە من لێرەدا نامەوێت بچمە ناو ئەم باسە ئاڵۆزەوە ئەگەر ئەوە بە بەرچاوەوە بگرین کە لە بەرهەمی ئەدەبی جیهانیدا لەیەك‌وەرگرتن و لەیەکچـوون و شتی‌دی زۆرە .. بێ‌گومان نموونەش زۆرەو خوێندەوارە بەڕێزەکان ئاگایان ، هەر هیچ‌نەبێت ، لەچەند بابەتێکی ئەم جۆرە هەیەو .. ئەمە تەنانەت لەلای ئەدیبە بەرزەکانیشدا بەرچاو دەکەوێت .. ئەگەر ئەمە بە بەرچاوەوە بگرین ، باری باسەکە بەلایەکی‌دیدا دەشکێتەوە .

ئەمەش نابێت ببێت بەبیانوو هەموو کەسێك ڕێ بەخۆی بدات و بەکاڵ و کرچی و نەزانانە لەم‌لاولەولا شت بقۆزێتەوەو بیکات بەماڵی خۆی‌و ، کە یەخەی گیرا .. بڵێت : ئەدی بۆ فلان بافیسار، کە کەڵە ئەدیبی جیهانین‌و شتیان لە خەڵك وەرگرتووە.

نامەوێت درێژە بەم پێشەکییە بدەم بەڵام بەبڕوای من دەبێت لەلێکـۆڵینەوەی ئـەم‌جۆرە بابەتەدا (بەپێی‌توانا) ، دوو خاڵ دەستنیشان بکرێت.

یەکەم : دەبێت ئەوە تۆمار بکرێت کە کام بەرهەمهێنیان بەر لەوانی‌دی پەیی‌بەو بابەتـە بردووەو بناغەکەی داڕشتووە.

دووەم : باسی ئەوەبکرێت کە هەریەکە و ئەو بابەتەی چۆن وەگرتووە بە چ جۆرێك هەڵس‌وکەوتی ئەدیبانەی لەگەڵدا کردووە .

من لێرەدا دەمەوێت هەوڵی ئەوە بدەم کە بەراوردێکی بەرهەمی شیعریی چەند شاعیرێك بکەم کە بەسێ‌زمان شیعریان گوتووەو هەمووشیان ـ لەو شیعرانەیاندا کە هـەڵبژاردوون ـ

وێنەیەکیان بەکارهێناوە ، بەڵام هەر شاعیرەو بەجۆرێکی جودا لەوانیدی وێنەکەی سوود لێوەرگرتووە.

وێنەکە ، تەرازوویەکە تایەکی لەبەرسەنگینی هاتووەتە خوارەوەو نزم بووەتەوەو نیشتووەتە سەرزەوی‌و ، تایەکی‌ی دیی لەبەر سووکی سەری کردووەو بەرز بووەتەوەو بە ئاسماندا چووەو ئەم شاعیرانە ، هەریەکەیان شتێکی .. یان ڕاستتر دووشتی بە دووتای ئەم تەرازووە چوواندووە .

یەکەم شاعیرو کۆنترینی ئەم شاعیرانە (مەنووچیهری) یە (أبو النجم أحمد بن قوص بن أحمد المنوچهری) .. کەتا ، یان تا پاش ساڵی ۱۰٤۱ ی ز ـ ٤۳۳ ی هـ ـ ژیاوە.[1] لەدێڕی سێیەم‌و چوارەم‌و پێنجەمی سەرەتای ئەو چامەیەیدا کە بەیارەکەیدا هەڵیداوە دەڵێت :

| | |
|---|---|
| نماز شام نزدیك است و امشب | مەو خورشیدرا بینم مقابل |
| ولیکن ماه دارە قصد بالا | فروشد آفتاب ازکوه بابل |
| چنان دو کفه سیمین ترازو | که این کفه شود زان کفه مایل[2] |

واتە : نوێژی شێوان نزیکەو ئەم شەو ، دەبینم وا مانگ‌و خۆر بەرامبەر یەکیان گرتووە ، بەڵام مانگ نیازی بەرزبوونەوەو سەرکەوتنی هەیەو خۆریش لە کێوی بابلەوە بەرەو ئاوابوون‌و دابەزین دەچێت ، وەکوو دووتای تەرازوویەکی زیوین کە ئەم تایەیان لەو تایەیان لاسەنگ ببێتەوە وایە .

لێرەدا دەبینین (مەنوچیهری) وەکوو سەرەتایەکی ڕۆمانسی ئامێو باسی سروشت دەکات‌و وورده وورده خۆی ئامادە دەکات بۆ بەیاردا هەڵگوتن‌و باسی خۆراوابوون‌و هەڵهاتنی مانگ دەکات‌و بە دووتای تەرازاوویان دەشوبهێنێت .

شاعیری دووەم ئەو شاعیرەیە کە (براون) تاکە دێڕێکی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا ذوکردووەتەوە[3] ، بێ‌ئەوەی باسی شاعیرو ناوو بەسەرهاتی بکات . تاکە دێڕەکەش ئەمەیەکە دەڵێت :

حسن ماەرا باتو سنجیدم بمیزان قیاس
پلەمە بر فلك شد ، وتو ماندی برزمین

واتە : شاعیر لێرەدا بە یارەکەی دەڵێت .. جوانیی مانگم لەگەڵ تۆدا لە تەرازووی پێوانەدا کێشانەکرد ، پلەی مانگ بە ئاسماندا چوو ، تۆ لە زەویدا مایتەوە .

نالی (مەلا خدری شارەزووری) ی شاعیری بلیمەتی کوردیش لە شیعرێکیدا بەرامبەر بەو توانجەی کە لە (حەبیبە) ی خۆشەویستی دەگیرێت و پێی دەڵێن کە (مەحبووبە خێڵ و قیبچە) ، وەڵام دەداتەوەو بەرگریی لێ دەکات و دەڵێت :

پێم دەڵێن مەحبووبە خێڵ و قیبچە مەیلی شەڕ دەکا
خێڵ و قیبچە یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا

نالی دەڵێت : ناحەزانە پێم ئەڵێن خۆشەویستەکەت خێل چاو لارەخێسە لە خەڵکی ئەکات وەك بڵێێ شەڕیان پێ بفرۆشێ ـ نەخەیر نەخێڵەو نەخێسەش لەکەس ئەکا . تەنها ئەوەندەیە (ترازووی) نازی ، کە چاویەتی ، کەمێك سەرئەکاو بەسەر لایەکا ناز زۆرتر ئەکا تا بەسەر لایەکی‌ترا ..[٤] سەرکردنی ترازوو ئەوەیە کە هەڵی ئەبڕی هەردو سەرەکری هاوسەنگ نەبێ شێخ ڕەزای تاڵەبانیش ، بەرامبەر بەو پرسیارەی کە کراوەو گوتراوە : ئەگەر (محەمەد) ی پێغەمبەری موسڵمانان پایەدارتر بووبێت ، ئەدی بۆچی خودا عیسای پێغەمبەری کێشایە ئاسمان و محەمەدی لەسەرزەویدا بەجێ‌هێڵا ؟. شێخ ڕەزا وەڵامی پرسیارەکە دەداتەوەو بەرگری لە محەمەد دەکات و لە پارچە شیعرێکییدا دەڵێت :

مسیح بر فلك و شاه انبیا بتراب
دلم ز آتش این غصه بسی كه بود كباب
سوال كردم ازین ماجرا زپیر فرد
چو غنچه لب بسخن بر گشود داد جواب
كه قدر هردو بمیزان قدر سنجیدد
كه چون گرانتر ازو بود درهمه ابواب
نشست كفه میزان مصطفی بزمین
بر آسمان چهارم مسیح شد بشتاب ...[٥]

واتە: لە کاتێدا کە مسیح (عیسا) بە ئاسماندا بەرزبووەتەوەو .. شای پێغەمبەران کە (محەمەد) لەسەر زەویدا ماوەتەوە . دڵم بە ئاگری ئەم خەمەوەبوو بە کەباب . ئەم ڕووداوەم لەپیری دانا پرسی ، کە لێوی ئاخافتنی وەکوو خونچە پشکووت و وەڵامی دایەوە ، کەپایەو بەهای

هەردووكیان بە تەرازووی پایە بەرزی كێشانەكردو ، كە ئەمیان لەهەموو ڕوویەكەوە لەویان گرانتربوو ، تای تەرازووی مستەفا (محەمەد) نیشتە سەرزەوی‌و تای مەسیح بە پەلە بەرەو ئاسمانی چوارەم بەرزبووەوە .

بەم جۆرە دەبینین شێخ ڕەزا ئەو وێنە شیعرییە بۆ مەبەستێكی دی بەكار دەهێنێت ، كە بەرگری كردنە لە بیروباوەڕی ئایینی‌و .. پایەی گرانبەهای محەمەدی پێغەمبەری خستووەتە تای ئەو تەرازووەوە كە دەنیشێتە سەر زەوی‌و پایەی عیسا ـ لە ئاستی محەمەددا ـ دەخاتە ئەو تایەوە كە لەبەر سووكی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمانی چوارەم .

مامۆستا (تەرزی باشی) كە باسی ئەم پارچەیەی سەرەوەی شێخ ڕەزا دەكات .. دەست بۆ شاعیرێكی دی درێژ دەكات كە هەر ئەم وێنەیەی پەكارهێناوە ، شاعیرەكە (نامیق كەمال) ی توركی هاودەمی شێخ ڕەزایە (١٨٤٠ ـ ١٨٨٤).

مامۆستا تەرزی باشی لە باسەكەیدا دەڵێت :

ئەم تاكە دێڕەی خوارەوە كە نزیكی ئەم مەبەستەیە (واتا مەبەستەكەی شێخ ڕەزا) ، هینی (نامیق كەمال) ە.

**جهان اربلب استعداده بر میزان عبر تدر**

**تنزلدر آغیر جوهرلرك شانی ترازووده**[1]

واتە: جیهان بۆ بەهرەداران تەرازوویەكی پەند بەخشەو ، ئەوەی گەوهەری گران بێت ، پایەو بەهای لەم تەرازووەدا دێتە خوارەوە .

ئەگەر ئەوەش بزانین كە نامیق كەمال شاعیرێكی شۆڕشگێڕی نیشتمان پەروەربووە ، تێ دەگەین كە مەبەستی شاعیر لەوەبووە كە ڕەخنە لەو كۆمەڵەی بگرێت كە نرخ و پایەی پیاو چاك و بەهرەدارانی لەلانەبووە . واتە مەبەستێكی كۆمەڵایەتیی هەبووە

ئەنجام :

كە بەم نموونانەدا دەچینەوە تەماشا دەكەین ، هەر یەكێك لەم شاعیرە بەهرەمەندانە ، توانیویەتی .. وێنەكەی ، بە شێوەیەكی جودا لەوانی دی‌و بۆ مەبەستێكی خۆی بەكاربهێنێت و

.. هەروەها نموونە شعیرەکانی ئەم شاعیرانەی کە لێرەدا بەپێی کۆنی و نوێیی سەردەمیانەوە ریزکراوە ، جۆرە بەرەو پێشەوە چوونێکی بابەتی ئەدەبیشمان بۆ دەردەخەن .

(مەنوچیهری) شاعیری بلیمەت کە بۆ یەکەم جار تەرازاووی بۆ بێ‌چوواندن بەکارهێناوە .. بۆ بێ‌چوواندنی دوو شتی ناو سروشت بەکار هێناو کە مانگ و خۆرە .. کەچی شاعیری دووەم بۆ بەراورد کردنی مانگی (سروشت) و رووی یار بەکار هێناوە .. کەواتە لە باسی سروشتی پەتی مەنووچیهرییەوە هەنگاوی بەرەو بەراوردکردنی مانگ و مرۆڤەوە ناوە .. لە کاتێکدا نالی بۆ باس کردنی تەنیا یارەکەی و ووردتریش بڵێن بۆ باس کردنی دووچاوی یارەکەی بەکاری هێناوە .. کە دێینە سەر باسی شێخ رەزای تاڵەبانی ... دەبینین کە وێنەکەی لە خزمەتی بەرگری کردن لە بیروباوەری ئایینی بەکار هێناوە .. بێ‌گومان ئەمەش فراوانترە لە بیری ناوئەو شیعرانەی ئەو شاعیرانەی پێش خۆیەوە .. چونکە بیروباوەرەکە نەك بۆ تاکە کەسێك .. بەڵکو پەیوەندیی بە کۆمەڵێك خەڵکەوە هەیە کە (موسڵمانەکانن). کەچی نامیق کەمالی تورك بۆ مەبەستێکی کۆمەڵایەتی گشتیتر بەکارهێناوە و هەوڵێکە بۆ بەرەوپێشەوەبردنی کۆمەڵ .. نەك تەنها کۆمەڵەکەی خۆشی .. بەڵکو وەکو بەیامی ئەدەب ، دەبێت ئەوەی لێ تێبگەین کە داوای ئەوە دەکات لە هەموو کۆمەڵێکی مرۆڤانەدا زاناو بەهرەداران رێزیان لێ بگیرێت .. ئەمەش داواکارییەکی مرۆڤانەی مەبەست فراوانە .

پەراوێزەکان:

١) ادوارد گرانفیل براون - تاریخ الادب في ایران - نقله الى العربية ، الدكتور ابراهيم الشواربي - مطبعة السعادة بمصر - ١٣٧٣ هـ - ١٩٥٤ م - المجلد الثاني - ص ١٨٨ .

٢) سەرچاوەی پێشوو - پەراوێزی لاپەڕە ٤٢ - ٤٣ .

٣) سەرچاوەی پێشوو ل / ٨٨ .

٤) دیوانی نالی - چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا بنەماڵەی مودەریسی - ١٩٧٦ .. ل / ١٠٨

٥) دیوانی شێخ رەزا - چاپی ١٩٤٦ - ل / ١٠٥

٦) عطا ترزی باشی - کرکوك شاعرلری - بەرگی دووەم - کەرکووك - چاپخانەی - جمهوریت . ل / ١٤٢ . ١٤٣.

شیعر

# ئەوشتانەی لەبیر ناچن*

شیعری: صلاح شوان

زۆر جار بووە
دڵم لەلای کچێ داناوە بۆ ساتێ
بەڵام پاشان
بیرم چووە لێی وەربگرمەوەو
ئیستایش
لەلای ماوە

* * *

جاریش بووە
خۆم و دڵم
میوانی شەوی ژنێک بین
کەسبەینێ چاوم هەڵهێناوە
دیومە:
هەرچیم هەیە
دڵم شەوێ لەگەڵ خۆیا بردوویەتی و
بەرووتی لەوێ جێی هێشتووم
چەند جارێکیش
لەباخچەیەکی لاچەیدا

لەچاوەڕوانیی ژوانی ئافرەتێکا
خۆم لەبیر چووە ئیستاکەیش
لەوێدا هەر چاوەڕوانم

* * *

هەندێ جاریش
لەپەرێزێکدا .. لەچۆلێ
هێلکە قەتیێ زۆرم دیوە
ویستوومە خێرا کەم بچم
کلاوە کەم بهێنمو
پڕی هێلکە قەتێ بکەم
لە خۆشییا پێم هەلنگوتووەو کەوتووم
لەترسانا ڕاپەڕیوم
فریای پارووپەکی هێلکەی
بەیانیانیش نەکەوتوم
بگرە لەوانەی یەکەمیش دوا کەوتوم

* * *

جارێکیش لە دوکانەکەی نزیک مالمان
شتێکی زۆر جوانم بینی
دام نابوو؛ باوکم ئێوارە لەکرێکاری هاتەوە
پارەم بداتێ ، بیکرم
بەلام کە دیم بە دەستبەتالی هاتەوە
لێی بێدەنگ بوم
ئیستا -کە رچی گەڕە کە کەیشمان نەماوە -
بەلام زۆر جار -کە پارەم دەبێ - دەمەوێ
بڕۆم ئەو شتەبکڕم
بەلام - داخەکەم - نازانم

منداڵەکان چی پێ دەڵێن

*  *  *

کە منداڵ بووم
دیوارەکانی حەوشەمان
هێند بڵند بوو
نەیدەهێشت سەرەتاتکێیەك
لەگەڵ کچە بچکۆلەکەی دراوسێکەماندا بکەم
بەڵام ئێستا هێندە نزمە
بەردەم هیچ گەردە لوولێکی
پایزانەم لێناگرێت و
لەچاوی بەدو بەدکاران
نام پارێزێ

*  *  *

کە منداڵ بووم وام ئەزانی
ئەم ژیانە لاپەرە یەکی سپییە
هەرچییەکی تیا بنووسم
وام دێتە رێ
کە فێربووم وشە بناسم
زانیم ژیان :
دەفتە رێکی شری پڕ لە
شەرەپشیلەی زەمانە
جێگای تەنیا وشەیەکی خۆشەیستیی تیانەماوە
بۆیە منیش هەرچی خۆشەویستیم هەبوو
خستمە ناو شیعرێکی بێدەنگەو
نەم نووسی

---

* ئاچێ: ئەچی..ناچێ

# بروسکه یه ک

محمه‌د به‌دری

هۆکاکه مه‌م

له‌و رۆژه‌وه که بارت‌کرد

رۆژ باری کرد

گواره‌و ملوانکه‌ی خاتو زین

له گێژاوی بوون‌و نه‌بوون‌و ماته‌ما

کرانه ته‌م، کرانه پرد

قژو ره‌نگ‌و هه‌ناسه‌پا

له‌و ده‌شته بێ پایانه‌دا

ئاواره کرد ...

هۆ کاکه مه‌م

باباتاهیر حه‌زی له گۆرانی نه‌بوو

له ڕێگه‌ی حه‌ق‌و راستی‌دا

خوارپ‌رستێکی سۆفی بوو

هه‌ر وه‌ك عیسا گیرووده‌ی داوی ناچاری‌و

حه‌واری بوو

ئاسمان ده‌نگی لێ‌بڕی بوو

رۆژی پاکیان لێ کردنه ته‌م

هۆ کاکه مه‌م.. زین نه‌به‌زی

له قووڵایی ده‌روونی‌دا هاواری کرد

هه‌ر چه‌نده گیرووده‌ی خه‌مم

خۆم هه‌ر خۆمم

هه‌ر وه‌ك جاران

دڵداره‌که‌ی کاکه مه‌مم ..

# چوار مرواری گەردانەیەك»

«قوبادی جەلیزادە»

١ ـ بۆ غازی فاتح وەیس

ـ دەترسێم بمرم ...

دەترسێم بمرمو

مەرگم نەبێ بەهۆنراوە ..!!!

ـ نا وامەڵێ ...

کە توولە ژانی هەواڵت،

«کفری» لەخەو راچڵەکانێ ...

لە «کۆیە» وە، هۆنراوەیێ

وەك پڵینگێکی بریندار،

چریکانیو

لە لێری شاعیرێ تۆرا ...

کەس نەیزانی، لەسێبەری

کام جەنگەڵی چروپرا

بەلادادێ ؟!

تاریكو روون ..

ئەستێرەیەکی شەکەتو چاو بەگریان

کشایە نێو، بیابانی چاوەڕوانیو

ئەو دەنگەو باسەی راگەیان:

ئەم بەیانە ...
لەنێو گۆمی خەمو خوێناو
لە ژوو سەری قەڵەمێکی جوانەمەرگا،
دڵی شیعرێ ..
دوا دڵۆپی دائەچۆڕان ....!!

٢ ـ کۆچ ...

سەیری خۆت کرد ...
تارمایی خەمێکی ڕەش بووی !
ئاوێنەکەت،
لەنێو پەنجە زبرەکانتا
ووردو خاشکرد.
بڕیارتدا، خۆت لەشەتاوێ هەڵکێشی.
کۆچت کردو
زەویش بە ترپەی نەزانیت ..!؟
ـ بۆ کوێ دەڕۆی .!
ئەم کێشورە، تاتەشۆرێکی بەرینە.
کۆڕهەڵکەنێ،
لەبناری ئەو گردەدا چاوەڕێتە !
کەتۆ دەستێکت هابیلەو یەکێ قابیل،
بۆ کوێ دەڕۆی ؟
شەوت لێ ئاوا نابێت و
بەدەستی خۆت شەهید دەبیت !!!

٣ ـ داستان

لە دایکم فێرە گریان بووم ...
لە باوکیشم، سەفەری دوور.

کە فرمێسکو چلوەڕوانی،
ئاوێتە بوون،
بوون بە شیعر.
ئێتا سیمرخێکی شیعر،
هەڵی گرتووم ...
بەدوای زامێکا دەکەڕێم،
داستانێك بێ بنووسێ ؟!

٤ -ژانە شیعر

لە ژوورەکەی تەنیشتمەوە ...
ژنێ دەزێو
لێرەش سرووشی شاعیرێ.
چریکەمان،
لە دوندو قوێپی ئاسمانا
تێکەڵاو ی یەکدی دەبن.
مەگەر هەر شاعیر بزانێ،
زامی کاممان قورس ترە ؟
«لە کۆشی ئارامی ئەودیو
گریەی کۆرپەیێ دەبیستم»
شەویش پیر بوو ...
ئای لەم ژانە توولانی‌یە ...
سینگم تادێ تەنگەتر دەبێ.
زۆر دەترسم،
بەسەر ئەم شیعرەوە بچم !!!

* * *

# شاری نهێنی

شیعری / سەلام محەمەد

کۆرس:

کێ گوڵی کوشت ؟ کێ ژیانی کردە گۆڕی زەردەخەنە

کێ خەونی پیرۆزی سوتتان ؟

کێ بەهاری خۆزگەی دزی ؟

کێ ..

کێ ؟؟

بۆ گوڵی کوشت ؟ بۆ ژیانی کردە گۆڕی زەردەخەنە

بۆ خەونی پیرووزی سووتان ؟

بۆ بەهاری خۆزگەی دزی ؟

بۆ ...

بۆ ؟؟

کەی گوڵی کوشت ؟

کەی ژیانی کردە گۆڕی زەردەخەنە ؟

کەی خەونی پیرۆزی سووتان ؟

کەی بەهاری خۆگەی دزی ؟؟

کەی ..

کەی ؟؟

دەنگ:

شەوێکی تاریکو تەزیو

بەکلیلی برووسکەی (بیر)

دەروازەی هەورم کردەوە

ویستم لەجیاتی خەوبینین

لادەمە شاری نهێنی

لەمدیو دەروازەی هەورەوە

کۆمەڵێ فریشتەی ئافرەت (بێ مەمك بوون)

وەکو بەندەکانی ڤان‌کووخ

دەورەی ئاگرێکیان دابوو
ئەخولانەوە، سەمایان ئەکردو جارجار
هاوارێکی دڵتەزێنیان لێوە ئەهات
لەسەر نوکە تیژەکانی ئەو ئاگرە
(لەپی دەستێك) .. دەرئەکەوت و بزر ئەبوو
لەناوەندی لەپەکەدا، دەمێك ئەیووت :
رێگای ژیانی هەمیشەیی لێرەوەیە
چوومە ژووری.

**تێبینی:**

«شاری نهێنی ، حەوت هەزارو حەوسەدو حەفتاوحەوت دەرگای هەیە ، هەر دەرگایەك ، حەوت هەزارو حەوسەدو حەفتاوحەوت ساڵی هەتاوی لەوەکەی ترەوە دوورە».

کۆرس:

بۆت دەرنەکەوت کێ گوڵی کوشت ؟
کێ ژیانی کردە گۆڕی زەردەخەنە ؟
بۆ بەهاری خۆزگەی دزی ؟
کەی خەونی پیرۆزی سووتان ؟

**دەنگ :**

کەپێم نایە ئەودیوەوە
حەوت هەزارو
حەوسەدو حەفتاوحەوت سەدە لەهۆش چووم و
کاتێ بێداریش بوومەوە
نە چاوم مابوو
نەدڵم .. نەمێشکم.
بەرێبواری ، هەر لەوێداو لە یەکەم دەرگادا مردم.

**کۆرس:**

کەس نازانێ کێ گوڵی کوشت ؟ کێ ژیانی کردە گۆڕی زەردەخەنە
بۆ خەونی پیرۆزی سووتان ؟
کەی بەهاری خۆزگەی دزی ؟
کەس نازانێ ... کەس نازانێ.

# گەرتۆنەبی»

ئومێدئاشنا

گەتۆنەبی، تەواو دەمرم

گەرتۆ نەبی، ڕۆژ دەبێتە، شەوی سامناك ،

ئێخەی دنیای ئازار ئەگرم ! .

کێوەك‌وتۆ ، بۆم دەسووتێ‌و

عەتری گەشکە

لەڕوومەتی ، ڕۆژەکانی تەمەنم ، دەپرژێنێ ؟!

کێ وەك‌و تۆ دەستی میهری درێژ دەکاو

«ڕۆمی کلۆڵم» لەزەلکاوی خەم دەردێنێ ؟! .

گەر تۆ نەبی، تەواو دەمرم ،

کەس ناتوانێ ، تۆزێ خەندە

بۆ سەرلێوم بێنێ ؟!

دەبمە شەوی بێ‌تروسکە !

بڕوام بەڕۆژ بونەوە نامێنێ !.

گەرتۆ نەبی تەواو دەمرم.

وەك مندالێکی دڵشکاو ، بەکوڵ دەگریم !

هەنسکی بێ‌تۆیی هەڵ دەدەم !

گەرتۆ نەبی دیسانەوە

هەوالی مەرگ ،

بۆ لێدانی دڵم ئەبەم !.
گەرتۆ نەبی ، تەواو دەمرم ،
دەبمە ئەستێرەو دادەخزێم
ئیتر ئاسمان نابینمەوە !
گەرتۆ نەبی ،
بێ‌نیشتمان ، دەمێنمەوە

ـ ٢ ـ

چونکە ، مرۆڤ ... !.
دڵی خونچەو ، کانیاوی ڕوونی ژێرزەوی ،
ڕومەتیان بەر، تیشك نەکەوت !
گوڵ بۆنی خۆی ، ون دەکات و
ئاسمان ڕەنگی

چاو ، بینابی ، زمان قسەی !
سنگ هەناسەو ، کچ قەشەنگی‌ی !
دڵ لەم چەرخەدا ، لێ بدا
گەروی هاواری خنکاوە !.
ئەی مرۆڤێك ...
کەسروشت و توانای ئاسمان !
بۆ بزەیەکی هیواتە ،

کوا دڵی‌تۆ ، کوا هەناسەت ؟!
کوا تۆزە خوریەیەکی ، تاسەت ؟!.
وەك تەنەکە ، قوتوی بۆش و قۆنەرەی کۆن !

لەسەررێگا ، فڕێ دراوی !
دەستت لەم لاو ، قاچت لەولا !
سەرت ونە ،
یا وەك یەخسیری كۆت لەپێ ،
كوختەكانت ، ساردو تاریك و چڵكنە !.
ئەی مرۆڤی چەرخی ئەتۆم !
زەردو كڵۆڵ !

پەنجەكانت ، باریك و درێژ !
هەنیەی درز بردوت ،
كەللەسەری ناو ئەشكەوت !
وەك مەیمونی ، دەست مندالآن
قورمیش دەكرێی ، بەبێ ئاگا سەمادەكەی !
چاوەڕوانی ، بەڵكە رێكەوت

زەوی ، یاسای سوڕانەوەی ، خۆی بگۆڕێ
مەگەر نەتزانی كە مێژوو ،
باوكی گەورەی میللەتانە ،
حكایەت بێژی ژیانە !
نەتبیست وتی:

بروسكەی گشت ئاسمانەكان !
تیری ژەهراوی دێوەكان !
لەهەنگاویا ، مت دەبن و كۆچ لەبەرن ،
چونكە مرۆڤ ، خۆی و دنیای هیواكانی
هەرە دوژمنی ، خوای شەڕن !.

حەمە سەعید حەمە کەریم

ئەی ئەوانەی بەدەم خەمو
ئازارەکانی خەڵکەوەن
بۆ لەئاستی خەمی هەندێ
هەزارانی ئەم خەڵکەدا وا خەوتوون

هەتاکو کەی ئاوا نووستوون
لەبەردەمی کێوی بەرزی سڵ کردنەوەی
ئەو خەڵکەدا
خۆتان وەکو (کەڕەی شەربەت)
لە سوچیکا شاردوٚتەوە
یاخود خەوتوون

ئەی بۆ ؟ وەکو سە رەتاتان
هاوراتان کرد، خۆتان وتتان
خەمو ئازاری، هەر خۆمان نا
هینی هەموو جەماوەری خۆیشمان نا
خەمی هەموو هەزارانی ئەم سەم ئەرزە
هەڵ ئەگرینو لە سەر شانی
هەزارانی ئاسان ئەکەین !.

دەکوا ؟ ئێستا تەنها
خەمی تاکە کەسیو خۆشتان ماوە
بووە بە بار بەسەر هەندێ
هەزارانی خۆشمانەوە !.
دەسا قوڕی سورتان بەسەر
رۆژێك دێتو خۆتان ئەڵێن
چیمان کردو چیمان لێ هات
قوڕمان بەسەر

---

(*) کەڕەی شەربەت:ـ پیاوێکی کەڕولاڵی شەربەت فرۆش بووە، دووکانەکەی تاکو ساڵی ٩٤٨ لە نزیکی خانەقای (مەحوی)یەوە بووەو خۆیشی هەرلە ژرووریکی خانەقادا ژیاوە، دووای ئەوەش، تاکو لە دنیا دەرچوونی دووکانەکەی لەلای حەمامی سورتدا بووە.

ئەم کابرایە لەگەڵ کەڕولاڵیەکەیدا، ئەگەر یەکێك تورەی بکردایەو سەری بکردایەتە سەری، ئەوا ئەم ئەوەندەی تر خۆی لێ کەڕ ئەکردو، خۆی وا پیشان ئەدا کە ئاگای لە هیچ نییە، جا مەسەلەی (کەڕەی شەربەت) لەمەوە هاتووەو ئێستاش لە سلێمانیدا هەر کەسێك خۆی لە شتێك بێ ئاگا بکات، ئەڵێ خۆمم لێ کرد بە (کەڕەی شەربەت).

# له چاوه‌روانی نالی دا

دڵشاد مه‌ریوانی

کۆرس : بارانێکی ئاگرین و ئاسمانێکی پیرۆزه‌یی
مه‌لی لانه‌شێواومانی عاشق‌کرد به گڕی سپی
باران باران ، ئاگر ئاگر ، ئاسمان ئاسمان ، بوونه ژیان
بۆ کۆتری شێواوه‌لان ، بوون به لان ، به نیشتمان

کوڕان : ئه‌ی ڕێژنه باران

کچـان : ئه‌ی قوببه‌ی ئاسمان

کوڕان : ئه‌ی مه‌لی بێ لان

کوڕان وکچان : بۆ عیشقی سپی سه‌ما ـ که‌ن
گه‌ردوونانه ته‌ماشا ـ که‌ن

کچێکی‌ته‌نیا : ئه‌ی ئاهووه‌که‌ی خانه‌بێزار
که‌ی دێیته‌وه ؟ که‌ی ؟ که‌ی ؟ بۆشار ؟
که‌ی دێیته‌وه لای حه‌بیبه‌ی
ماڵی ئاوای ، وێرانه ماڵ ؟

**کوڕێکی تەنیا** : نیشتمانەکەم ؛ ئاوەدان بکەن !
خودی نەتەوەم ؛ شارستان بکەن !

**کۆرس** : لە ئاسۆوە تیلماسکێکی ئاڵو بەرین
کۆترەکانی وەکو دڵمان بە خوڕ دەگرین
دەگرین بە خوڕ دەگرین بە خوڕ
بۆ تیلماسکی ئاڵ وەکو گڕ !

**کوڕان** : ئەی تیشکی بە هەور دڕ

**کچان** : ئەی هەوری ڕەشی قژ بژ

**کوران** : ئەی تارمایی هەردەم کرژ

**کوڕان وکچان** : بۆ ئومێدی ئەو ئاسۆیە چۆك دادەن
بۆ ئەو هەموو ڕەنگو بۆیە چۆك دادەن
بۆ ئەو هەموو ڕەنگو بۆیە چۆك دادەن

**کچێکی تەنیا** : هاکا لافاوی ڕێژاو
جێی دزەپێی شوشتەوە
هاکا عیشقی خۆرەتاو
دەواری هەڵخستەوە

**کوڕان** : زرنگەی پیاڵەو گیزەی سەماوەر
بوونەوە هاوڕێی شەماڵو سێبەر !

**کچان** : هاکا هەواڵی بووکی ئاڵا ئاڵ
گەیشتە زاوای بەردەمی ڕەشماڵ !

**کوڕان و کچان** : زەنگی وولاخی کاروانی بەهار
حەزرەتی نالی ی خستەوە گوفتار

**کوڕێکی تەنیا** : کۆترانی شیعری لان شێواوی من
پەپوولەی ڕۆحی دڵ ڕەنجاوی من
لەسەر تەنافی شەختەی غەریبی
هەڵکورماون و ئێستاش دەلەرزن !

**کچێکی تەنیا** : ئەی ئاهووەکەی خانەبێزار
تکایە بێرەوە بۆشار
بێرەوە بۆلای حەبیبەی
ماڵی ئاوای وێرانە ماڵ .

**کوڕان** : لە ئاسۆوە ڕێبوارێکی خەم شیرین
**کچـان** : چاوەڕوانە عەرەقی ماندووی بسڕین
**کۆرس** : کاشکا هەموو یەك دڵوگیان بۆ لایدەچووین
کاشکا بە دیداری بەرزی سەربەست دەبووین

**کوڕان** : دەچووینە لای
**کچـان** : دەچووینە لای
**کوڕان و کچان** : یەك دڵوگیان بێ ڕكوكین
یەك دڵوگیان بێ ڕكوكین

**کوڕان** : هەموو خەممان
**کچـان** : هەموو خەممان
**کوڕان و کچان** : دەکرد بەیەك خەمی شیرین
دەکرد بەیەك خەمی شیرین .

# هۆرەیەك لە گەرمیانەوە

عبدالوهاب تاڵەبانی

منداڵ بوم ، زمانم
تازە گۆی ئەکرد
گەواڵە هەوری بەرزم دەبینی
لای ئێمە نەدەوەستان و
بەرەو ژوور ملیان دەنا
لە باپیرەمم دەپرسی :
بۆ کوێ دەچن ؟
بۆ لێرە نابارن ؟
باپیرەم دەیگوت :
هەوری باران نین
هەوری بەفرن
ئاشنای لوتکەی بەرزن
گولاوی گەرمیانیان پێ یەو
بەسەرچیای بادینانا
بەفرو هەنگوین ،
نێرگزو نەڤین دەبارن

شیعر

# ئافرەت هەمیشە جوانە

عوسمان هەورامی

هەر کەس بڵێ
لەسەر زەوی ئافرەتی ناشیرین هەیە
تا خوێن لە لەشمائەگەڕێ
لیێ بە ڕقمو لە بەینمانا
جەنگی نەبڕاوەو قین هەیە ،
ئەو کەسە بۆ خۆی دزێوە[1]
بۆ خۆی وەك درنج و دێوە !! ،..
کێ بوێ هەیە بە توانجەوە
لە خاك و ڕۆژ
لەئاو و لە هەوا بدوێ !!
هەر چۆن ڕقی ڕەش بیەوێ
سەرچاوەی ڕوون داپلۆسێ ،
پێوانەی گەردوونی دروست
پێچەوانە
تۆمار بکات و بینووسێ !!
کێیە سواری سەری خۆی بێ و
کوێرانە بە خۆی بنازێ
لە ڕاستی هەڵ گەڕێتەوە !!!
ئەو نازانێ کە بترازێ
زەحمەتە خۆی بگرێتەوە ...

ئافرەت چاوەی هەموو چاوە جوانەکانە
ئافرەت چاوەی هەموو چاوە جوانەکانە
ئافرەت کرۆکی جیهانە
ئەوەندە شانازیی بەسە
سەرچاوەو بوونو ژیانە ...
ئافرەت بێ وێنەیە ، تاکە
ئافرەدایکە
ئافرەت خوشکە
ئافرەت باوکە
ئافرەت خۆشەویستو بینایی هەموانە
ئافرەت لەخۆیا ، هەر بۆ خۆی
مەنگیو نهێنی گیانە ،...
ئافرەت باڵی سۆزی بێ بەرو دوایە
ئەگەر وتیان
هەموو دەریاو ڕووبارەکان وشك ئەبن
کانگای سۆزی ئافرەت هەرگیز ،
هەرگیز ، هەرگیز لەبن نایە ...
گیانی بێ گەردی حەوایە
لە تویێ هەموو شتێکایە
بێ تـینو سۆزی هـەناوی
بچـووکتـرین پێداویستی ژین پێك نایە ...
ئافرەتە سەرچاوەی تینە ،
ئەم سەرو ئەو سەری ژینە
شیرینترین
سەرچاوەی ژینی شیرینە
ئافرەت بۆ خۆی سەرەتایە
بۆ خۆی کۆتایە ...
کۆتایە ...
دزێو : ناشرین

# «چەند ئاگاداریی یەکێ لە پێشوازیی» هاتنتا

شیعری : بەرزان هەستیار

« کە هاتیتە ئەمدیو سنووری ئازارەکانمەوە ، با سەرەتا ئەم ووشانە دیاریی بن تا چێژی ساتە ڕەنگینەکانی داهاتوومان لە لا شیرنتر بێ » .

دەستم بەرەو چراکەی تۆ ڕاکێشاوە ،

من نامەوێ ئەمشەو بێ چرا گوزەرکەم

(زستانیپێرارم ، شەستەکەی

کوا ئەیتوانی چراکەی دەستم بشکێنێ

گەر«گوڵە » خۆی ووردو خاشی نەکردایە !

خۆی نوقمی نێو گێژەن کردو

خوێنی عەشقی پیرۆزیشمی ..

بێپەروا کردە کاسەوە ،

ئێستاکە ئەو خۆی خنکاوەو

من دەستم گرت بە شاباڵی پەری ئارامو هیواوە

ئا ، ئەو خنکا ، ڕۆشتو ونبوو ،

دەسا وەرە تۆ گوێ بنێ ،

بەسەر دڵی دوا فرمێسکو هەناسەوە

* * *

ئەزانم دێیت ،

ئەزانم چۆلەکەی ڕازت

وورد کەوتۆتە باڵەفرە ،

بەڵام تۆبیو چاوی کاڵی سوزو ئەڤین ،

گەر ئەتەوێ لە سێبەری سەری منا

سیاماڵی[1] خۆت هەڵبدەی

باڵای ماندوو بوون بگرە گڵ

من نامەوێ چیتر دڵم ،

بەدەم گلپەی ناسۆرەوە

ببێتە پارچەیەك سکڵ[2]

* * *

ئەزانم دێیت ،

کە هاتیشیت من ئەمەوێ

لە سیروان ، بەی ، نەتخنکێنێ

ئەبێ (حەساروێست ) ی ژانم لەگەڵ ببڕی ،

ئەژنۆکانت لە خاك نەدەی ،

من بەندەری زامو خۆزگەت ،

تۆش چوار کوچکەی ووڵاتی دڵی من تەیکەی

ئەمە عەشقەو گەر وا نەبێ

مەنزڵ ئەبێتە سەراب و[3]

لەوێکا ئەنگووستە چاو لەشەوێکا

لە پەلوپۆی حەز ئەکەوین

لە شەوێکا تاریکستان

لە گابەردی ڕێ ئەنەوین

ئەمە عەشقەو گەروا نەبێ

بە بێدەنگی ، بێ ناونیشان ،

هەردوو ئەمرین

* * *

ئەزانم دێیت ، کە هاتیشیت چاو دامەخە

ڕۆندکە[٤] یان زەردەخەنە ، با ببینم ،

ئەم کاروانە ڕێگەی هەورازو نشێوە ،

ها دەفتەری ئێستاو دوێنێم بیخوێنەوە

سەرگوزشتەی نیشتمانێکی کلۆڵو

وێرانە ماڵی هەژارو

زامی گۆشتەو زوونی عەشقە ،

بێئۆقرەکەی خۆمی تیایە ...

تۆش کە هاتیو گەشتیتە لام

خۆت بۆم باسکە ،

بابزانم پەڵە هەوری چ ئاسمانێ

دائەکاتو ئەبێتە بارانی وەڵام !

---

(١) - سیماڵ : ڕەشماڵ .

(٢) - سکڵ : پشکۆ ، پەنگر .

(٣) - سەراب : تراویلکە .

(٤) - ڕۆندك : فرمێسك ، ئەشك .

« ••••• »

فەرید زامدار

بۆ ... «دەریا» ...

یەکەم هەنگاو
یەکەم سەفەر
یەکەم ڕێگا ...

هێشتا ساوای
لە ڕووانینی شێتانەی خۆت
لە زمانی شیعری من ناگەی تا نەبیت بە خوێنی شیعرو ، گەورە نەبیت
لە ووشە یاخیو

کۆچەریەکانی من ناگەی

لەم سەردەمە جەنخاڵەدا

هەر ووشەییکم لە شوێنێ
لە هەوارێ
سەرهەڵدەدا

هەر شیعرێکیش بێ وولات بێ
لە ناو ژانی برینی ووشە قەرەجەکان
خەمەکانی بەڕێ دەکا

لە هەر وولاتی برینێ ئازارەکانی کۆچ بکا
خاك دەسووتێ و ئاسمان دەڕوا
تۆ هێشتا ساوای نازانی

چ خەمێکی کوشندەیە
ئازاری بێ نیشتمانی
چ عیشقێکی شیرینەوا
منی خستۆتە سەرشانی
بڵندترین کێوی بڕوا

کچم «دە ریا»
خۆ دەزانم چاوەکانت
پڕن لە شەپۆلی بریا
بڕوابکە، تاکوئێستا

دەنگەکانی گیانی مێژوو
خەڵوەتگری بێ هەوارن
پڕن لە هەناسەی ماندوو ...

هەزاران جار ئەم وولاتە
گڕیگرت و هەر نەسووتا
هەزاران جار

زەمین مردوو ، ئاسمان گریا
هەزاران جار
مەرگی سووری ، خۆریان نووسی و

خۆر هەر ژیا
تۆ پێش بوونت ، هەر گەورەبووی
نەشهاتبای
له ناخمدا تۆ هەر هەبووی

وەختێ هاتی، له سەردەمێگدا تۆهاتی کەنازانی
ژیان خەونێکی سەرکێشە
سەرەتای ڕێی جیهانێکی سەرەولێژە
یاخی بوونە
کۆچ کردنە

سەفەرێکی دوورو درێژە ! ..
تۆ پێشەنگی زەمانێکی
ئەو سروشت و ڕێگاو شوێنە

هەمووی بۆ تۆن
مانگ و ئەستێرەو هەتاویش
بە دووای ڕووناکیتا دەڕۆن !...

هاوینی / ۱۹۸۲

چیرۆك

# پەیکەر و پیاو

غفور صالح عبد الله

سێبەرەکەم بەسەر بنەما باڵە بەرزەکەمەوە بە لای پشتەوە شۆڕبۆتەوە سەر زەویەکە. بە سەر سێ پەیژەی بنەماکەدا بەهەر چوار لاوە گوڕێچەیان داوە.. سێبەرەکەم دەڵێ ئاوێکی خوڕ و لەسەرەخۆیە، بەسەر تاتەبەردو تەقتەقە تاوێرکانەوە داکشێ، بەوجۆرە بەسەر پەیژەکاندا داچۆڕاوە. هەموو رۆژێك لە و وەختانەدا بەو شێوەیەم. چوار مەترێکیش سێبەرەکەم درێژبۆتەوەو چمکێکی گەیشتۆتە سەر قیرتاوەکەش. واتا سێبەرەکەم ئەوەندەو نیوێکی خۆم دەبێ. خۆشم لە دوو مەترو نیو درێژی دەدەم. پانایەکەشم بەگوێرەی پانایی دوو زەلامی دەمەزراو دەبێت. بەرووخسارێکی نیمچە پێکەنین و گرنج‌گرنج و برۆنزیەوە هەمیشە دەستێکم ئاخنیوەتە گرفانێك دەستی راستیشم شۆڕکرووتەوە. دەڕوانمە پردە دێرنیەکە. بەم رۆژگارەش جار نا جارێك کۆترێك لەسەر یەکێك لە شانەکانم دەنشێتەوە. دوای ئەوەی تیشکی خۆرەکە وەڕزی‌دەکات، ریقنەیەك دەکاتە سەرو پۆتاکمەوە ئەنجاش بەکەیف و خۆشیەوە دەداتە شەقەی‌باڵ. لەئاسمانی گۆڕەپانەکەدا تێکەڵ بە هاوڕێکانی دەبێ. هاوڕێکانیشی لەترسی شلپ‌وهۆڕ و ژاوەژاوی سەر شەقامەکە بەیەکادێن. دواجاریش هەرکە ماندوو دەبن، خۆیان دەکەنە ژێر سێبەری ئاپارتمانەکانەوە ...

## پیاو ..

لاقی چەپم نووشتانۆتەوە، لاقەکەی‌تریشم درێژکردوە. پاژنەی پێم خستۆتە سەر تاکە کڵاشە چەکەکەم. جەستەم لەپشتوێنەوە بە گۆشەی «١٢٠» پلە چەماوەتەوە. دە پەنجەی هەردوو دەستم لەسەر سنگم تێککگیرکردوە. گەردنم لە نێوان سەرم و هەردوو شانمدا بەسەر لادیواری

بنەمای پەیکەرەکەوە گۆشەیەکی «١٠٠» پلەی دروستکردوە. چاوەکانم بە ئەبڵەقیەوە بڕیوەتە سەنووقی بۆیەکەم. ئەویش وەکو خۆم پەرپووت و لە چەند لایەکەوە لاکەل بوە. کەنەفت و پەککەوتەیە. ئەوەندەش نابووت بوە ناتوانێ زگی پڕ برسیەتیم تێرکات.. کورتەکە دڕاوەکەم لە یەخەوە بە جوغزێکی ناتەواو، سنگە تووکن و تیسکنەکەمی خستۆتە سەرپشت. خوێناوی چڕاوگەی ئارەقە بە نێو مووەکانیەوە لەسەر چاڵاتی سەرووی سنگمەوە یەکیانگرتوە و ووشکبوونەتەوە. گلێنە رەشەکانم لە ناوەڕاستی شپێنەی چاوەکانمدا رەپ وەستاون. جووڵە ناکەن. ناتروکێن، تەنانەت فرمێسکیشی ووشکبوتەوە. لە مێژە زەردەخەنەیەك بەسەر لێوە شەقارەکەمەوە هەڵتۆقیوە، هەروەکو ئەو زەردەخەنانەی لە وێنەیەکی فۆتۆگرافی چاپدەبن. مێژووی لە چاپبوونی ئەم زەلادەخەنەیە نەزانراوە کە چەند چرکەیەکە، یاخود چەند سەعاتە. زەردەخەنەو گلێنەکانم لە یەك دۆخ و ئاست وەستاون هەرگیز جێلەق نابن ...

## پەیکەر

نیگاکانی پیاوە راکشاوەکەی ژێر سێبەری بنەماڵەکەم، عەشاماتەکەیان بۆ لای خۆیان وەرچەرخاندوە. برە دوکانەکانی ئەو بەرەوە جمەی‌دێت. خەڵکەکە سەریان بەسەر یەکترەوە دەتەقێ. لە یەکتر مۆڕدەبنەوە. هەروەکو لە سەرەتای پەیابوونیانەوە رقیان لە یەکنز هەڵگرتبێ. وەکو مێرولەی بەئاگرو ئاو گوریچەدراو، سەربەرەو ژوور، سەربەرەو خوار بەپەلەن. لەشپرزەییدا لووتیان دەتەقێ بە لووتی یەکترەوە ـ خۆ لە دێرزەمانیشەوە شپرزەن ـ هەندێ لەو خەڵکەش وەکو مێشێك میوانیان نەبێت، بەگەمژەیی و لۆژە لۆژ لەرێ و رێکردنا لەتردەدەن. گەرچی سەرخۆش نین، بەلام لەوەتەی لەم گۆڕەپانەوا هەم ئەم عەشاماتە بەم جۆرە دیومن .. لە پرێکیشدا نیمچە سۆزانیەك، یاخود پتر سۆزانیەکی بەحورمەت لەگەڵ هەوەس‌بازێکدا هەڵدەتۆقێن. سەراپا مێژووی مرۆڤایەتی لەمەڕ ئەوان دەبێتە ئەو رەفتارە. دەبێتە دەمەقاڵیان. یەکتری بەبێ‌شەرمیەوە دەشۆڕنەوە، یەکتر تێر جنێوی ناشیرین دەکەن. ئەنجاش بەبێ‌باکیەوە لەیەك جودادەبنەوە .. یالە ناوەڕاستی شەقامەکان دوو ئافرەت بەیەك دەگەن و دەکەونە دەمەوەری:ـ

ـ مناڵەکانت چۆنن ؟ خۆ نەخۆش نین ؟

ـ دەستت ماچ دەکەن ..

ـ ئەی مێردەکەت ساغ و سەلامەتە ؟ ئیش وکاری چۆنە ؟

ـ ئەویتریان هەناسەیەکی سارد هەڵدەکێشێ و دەڵێ:ـ

ـ لێکەوتوە. تەنانەت ناتوانێ ئەرکی مێردایەتی خۆی بەجێبهێنێ .. ئەویتریانیش بەخۆشی و بێشەوە وەرامی‌دەداتەوە:ـ

ـ ماڵ خوا بێ. مێردەکەم هێشتاکە بەبەریەوە ماوە ..

لەو ناوە دەبێتە هەراو ژاوەژاو. سەرخۆشێك لەناوەڕاستی شۆستەکە لەسەرگازی پشت وەڕکەوتوە، کۆنەفرۆشێك جرتێکی بۆ دەکێشێ. ئافرەتێکی حەیشەری بەجووتە چاوێکی بەئاشقاڵەوە زمانێکی لێدەردەکات. کابرایەکی پۆشتە دراوێکی بۆ فڕێدەدات. بەسەر لەقاندنەوە بەجێی‌دێڵێ. بڕە منالێکی لاسار تێر جنێوی دەکەن و دەکەونە سەرگوێلاکی یەکتر...

## پیاو

ماوەیەکە ـ هەرمنم وارسی عیسا بێ‌ژن و ماڵ‌و بێ‌کوڕ و مەئوا ـ ژنەکەم و کوڕە تاقانەکەم پاش بزربوونم، شوێن هەواریان سڕایەوە. یاخود دەشێ من لەلای ئەوان شوێنهەوارم سڕابێتەوە، لەگەڵ کەسێکی‌تردا باروبنەیان بەرەرەو ژیانێکی ئاسوودەتر گواستۆتەوە..

هەر لەو دۆخەی خۆم چرکەیەکم نەکردوە. سەنتیمەترێکلیش نەبزووتوم. لاقی چەپم نووشتانۆتەوە، لاقەکەی‌تریشم درێژکردوە. گلێنەکانم لەناوەڕاستی سپێنەی دیدەکانمدا ڕەپ وەستاون ..

## پەیکەر

سێبەرەکەم دوو سەنتیمەتر درێژتر بوە.. بەری «٣٠» ساڵیش لەم گۆڕەپانە هەرهیچ شوێنهەوارێکم نەبوو، بگرە بیرشم لێ‌نەکرابۆوە.

## پیاو

ئەم گۆڕەپانە بەری «٣٠» ساڵ بەزۆرەملێ دوو تۆمبیلی پێدا دەرۆییشت. بەم زۆریەی ئێستاش دوکان و کۆگای جامخانەبەنی بەخۆیەوە نەدیبوو. ئەوەندەش ژاوەژاو و هاژەو هەراو هوریای ئەم رۆژانەی نەبوو. جگە پاش ئەوەی دەنگی کۆڵێشە «فەیلیەکان» نەبێت ئەو ناوەیان دەشەلەژان و کپ‌دەبوو. ئەگینا ئەوناوە دەبوە ساباتی بێدەنگیەکی ترسناك. تەنها ئەو رۆژە نەبێت بەری «٣٠» ساڵ هەر لەم گۆڕەپانەدا گوللەی پۆلیس پێ راستی پێکام. خەڵکە نەناسیاوەکە وەسەر شانی خۆیانیان خستم. بەدەم خۆپیشاندانەوە داوای نەمان و رووخاندنی

دەورو دایەرەی «پاشا» یان دەکرد. ئەونـاوە بوە رۆژی حـەشر. دەرزیت هەڵدایـە بەسـەر خەڵکیەوە دەکەوت. هەر ئەو رۆژە دوای ئەوەی هەندێکیـان لە خەڵکـەکە قـەڵوپاچـە کرد وبرێکی‌تریشیان برینداركرد. بۆیە لەترسان ئەوانی‌تر بـڵاوەیان لێکـرد. منیش بەو خـوێن‌و خورەوە بەرەو کونە تاریکەکە راپێچیان‌کردم. پاش دوو سێ مانگی برسیەتی و هاوارو قیژەی نەگریسی شەوانەی پۆلیسەکان. دیسان بوومەوە هاوڕێی بەرەڵایی شەقامەکان. بە زگی تێرو بە زگی برسی ئەوو رۆژم لە کوختە چڵکنەکانی شاردا دەدایە دەم‌یەکەوە ..
خۆشم نەمزانی ئەو رۆژە چۆن عەشاماتەکە لەگەڵ خۆیاندا راماڵیان کردم. بەزۆرەملێ بوومە یەکێك لە عەشاماتەکە .. دوو مانگ بوو بێ‌لانەو ناسیاو شەقامو کوچەو کۆڵانە لەوتاوەکـانم تەی‌یدەکرد. بەدووی کارێکەوە دەگەڕام تاوەکو بوونەکەی خۆمی پێ بپارێزم. هەرچەنێ ئەو کارە چەپەڵ و بەدناویش بێ. لەترسی ئەوەی لەبرسان نەیەمەلاوە...

تازەکی بەر لەو رۆژەی هەرای عەشاماتەکە، کاری کۆڵکێشم لە یەکێك خانەکاندا دۆزیبۆوە، بەشەویش هەر لەوێدا دەنووستم. منێك کە لە گوندەکەی خۆمان لەترسی هەڕەشەو گوڕەشەی ئاغای گوندەکە سەری خۆم هەڵگرتبوو، خۆم خستبوە دۆزەی ئەم دەربەدەریـەوە، چونکـە هەمیشە سەرم دانەدەواند بۆ ئەرکێك بڕوام پێی نەبوایە. لە گشت کارو بیرکردنەوەیەکدا بێ‌لایەن بووم. هەقم بەسـەر هیچ بگرەو بەردەیەکەوە نەبوو. بـۆیە گـوندم بـەجێ‌هێشت و رووم‌کردە ئەم شارە پڕ ئاشووبـە. لە گونـدەکەمـان کەس‌وکـارێکی جگەرسـۆزەی ئەوتـۆم شك‌نەدەبرد، بۆ ئەوەی رێگای سەرهەڵگرتنم لێبگرن. پاش هەرای عەشاماتەکەی ئەو ساڵەش چەندان خۆپیشاندانی‌تری هەر لەم گۆڕەپانەدا کۆدەبوونەوە و بەڕێدەکەوتن. منیش هەموو جارێك لەگرمەی ئارەقەرشتنی کارکردندا هەمووکارەساتێکی لەو جۆرە لێشاوی عەشاماتەکان رایاندەماڵیم. دەبوومە تەلاتە دارێکی بەر لۆزی گەرداو. ئەنجامیش بۆ بای بێ‌وولەتی بـەو هۆیەوە دەبوومە میوانی کونە تاریکەکان..

* * *

پاش ساڵانێکی دووردرێژ بۆ گوندەکەمان گەڕامەوە. کچێکی دوورە خزمی خۆمم خواست. بۆ یەکجاریش دوای ئەوە بەرەو شار باوو بنەمان گـواستەوە .. دیسـانەوە رۆژێکیـان هەمـوو جەشتەم گریسی کارگە هەڵکێشرابوو. چەند ساڵێکیش بوو عەشاماتەکە لە خۆپیشاندان وازیان

هێنابوو .. سێ زرتەبۆز بە چاوی دەرپۆقیو و بەپەلە بەرەو رووم هاتن. دیسانەوە خزامە نێو کونە تاریکێکی نوێترەوە. دوو رۆژو شەو نان و ئاو بە گەروومدا نەچووە خوارێ. نەخێر دیسانەوە کونە تاریکە نوێیەکان سیخناخ بوون. خەڵکێکی هەمەچیزەیان تێدا تەپاندبوو. پاش ئەوەی پێنج ساڵ زیندانی بێتاوانیم بەسەربرد، کەوتمەوە تەیکردنی کوچەو کۆڵانەکان ..

## پەیکەر

سێبەرەکانی تری دەورو بەرەکەم خەریکبوون، سێبەرە درێژەکەی منیان لە گشت لایەکەوە ئابلووقەدەدا. پاش چەند دەقیقەیەك لەگەڵ سێبەرەکانی تـرا تێکەڵ دەبـوو. هێشتاکـە ئەو حاڵەتە نەهاتبووەکایەوە. لەپڕێکدا سێبەرێکی بەڵەك بەڵەك ئەو ناوەی گرتەوە، گەرچی هێشتاکە خۆرەکە دوو گەزی بە ئاسمانەوە مابوو. چەشنی سێبەری گەواڵە هەورێك ئـەم لاو ئەولای دەکرد، خەڵکێکی زۆر رژاوەتە سەر شۆستەو شەقامەکان و دەڵێن:ـ

ـ رەوە کۆترەکان پێشبینی بەلایەکی گەورەیان کردوە بۆیە وەها سەریان لێتێکچوە ..!

دەتووت لەترساندایە ئەو رەوە کۆترانە وەها بەچرپەوە بە ئاسمانەوە چوون بەیەکاو گۆڕەپانەکە بەرنادەن. خەڵکەکەش بە حەپەساویەوە چاویان بڕیوەتە رەوە کۆترەکان، چونکە لەوەتەی ئەم کۆترانە لەم دەوروبەرەدا هەن، بەو شێوەیە نەبوون ئەوەندەش ژمارەیان زۆر نەیوە.. پیاوەکەش هێشتا هەر لە دۆخەکەی جارانیەتی لەپاڵ لادیواری بنەماکـەدا، چونکـە هەر لە بـەیانیـەکی زووەوەیە بـۆ دواجار مـاڵئاوایی لە ژیـانە سەختەکەی کردبوو. لەو ساتەدا لەپڕێك گرمەیەکی گەورە هەڵسا، سەرتاپای شاری ووروژان، دەنگیدایـەوە. ژاوەژاو و هاتو هـاواری شار کپبـوو، کش و ماتیـەکی کوشندە باڵی کێشا بەسەر گۆڕەپانەکەدا. رەوە کۆترەکان پەڕو بـاڵیان هـەڵدەوەری. ئەنجاش بە مردووی دەکەوتنە خوارەوە. ئەوەندەش پەڕیان لێبۆون تاوەکو لاشەی پیاوی ژێر بنەماکەی منیان داپـۆشیو بوە کلکـۆی نامـۆیی.. بەڵام منیش هێشتـاکە دەستێکم ئاخنیوەتە گیرفانێك، دەستی راستیشم شـۆڕکردۆتـەوە و دەڕاوانمە پـردە دێرینەکە ..

بەغداد ١٩٨٤

* * *

چیروك

# کەڤالێ بێ پەرواز

محمد سلیم سواری

هند خودیت .. یێ د هولەکێ ڤە .. بەرێ هەمی مرۆڤێت د هولێ ڤە ... ل کەڤالێت بدیوارا ڤەبو . ئێک ب رەخ یێ دیڤە راوستیابو .. بێ دەنگییێ پەردا خو ب سەر هەمی هولێدا گرتبو .. ماو بو خو گۆت :-

«ب نیشانا ئەڤ پیشانگەهە گەلەکا هێژایە .. دیارە یا هونەرمەندەکێ بەرکەفتی یە .. دەستێت وی دخوشبن .. تەخسیر نەکریە .. ئەو تشتێ ژێ هاتی یێ کری» .

ل سەر ملێ راستێ زڤری بو ملێ چەپێ .. دا چاڤێ وی ب هونەرمەندێ خودانێ پیشانگەهێ بکەڤت .. بەلێ چو گومان ژی ب کەسێ نەبرن کو خودانە :-

«ڤەی خودان ژی دیارنینە ، دڤێت ل ڤێرەبا .. دا بو خەلکی ناڤ و نیشانێت کەڤالێت خو دیارکربانەو .. رامانێت وان بشاڤتبانە» بەران بەرێ کەڤالەکی راوستا .. دیمەنێ مرۆڤەکێ رەش هاتە پێش چاڤا .. چاڤێ رۆژێ ژی .. تیرۆژکێت خو د پرچا سەرێدا بەرزەکربون .. قەیدەکا ب زنجیر ل بەر پیا دئاخێ وەربیو .

ماوسەرێ خو هەژاند .. پشتی باش د رامانا وی کەڤالی گەهشتی .. دەست دا بەریکا خو .. دا جگارەکێ بەردەتێ .. د مرۆڤێت هولێ ڤە نێری، کەسێ چو جگارە نە دکێشان .. زانی کو جوانی و رامانا وان کەڤالا جگارە یێت ژ بیرێ برین .. ئێکسەر دەستێ خو ڤەکێشا .. ل گەل خو گۆت :-

«ب راستی د هولێت کەڤالاڤە .. جگارە کێشان نە یا د جهێ خودایە ، چونکی کادیا وان .. دێ دیمەنێت کەڤالا د مژو مورانێ وەرکەت و .. جوانیا وان ژی بەرزەکەت» .

دوسێ گاڤ هاڤێتن .. ملێ وی یێ چەپێ ، ب ملێ راستێ یێ مرۆڤەکی کەت .. چاڤێت هەردوکا ڤ ئێک کەتن ، کەسێ چو نە گۆت .. هەردوکا چاڤێت خو ژئێك وەرگێران ، دا بەرێ هەردوکا

بكەڤالەكى بكەڤت .. درێژو درێژ هەلاويستبو .. چو ژ كەڤالى نە برە دەر .. سەرێ خو بادا وبتيويەكى بەرێ خو دا كەڤالى .. بگازندە ل گەل خو ئاخڤت :ـ

«ئەڤە چتوڤ كەڤالە .. درێژو درێژ يێ هەلاويستى ، هەكە پان و پان دانابا ، دبا مروڤى تشتەك ژێ زانى با .. بەلێ درێژو درێژ هونەرمەندى يێ حەزكرى .. كەڤالى دانت .. حەزكرنا مەو وى ژ ئێك دويرن ، دبت ئەڤە ژى مودەكە .. ديارە دارێتنا ڤى كەڤالى دخازت هوسا بهێتە هەلاويستن .. ل گەل هندێ چاڤێ وى بكاغەزەكا بچوك كەت ، بكوژيێ خارێ يێ كەڤالى ڤەبو ، سەرێ خو نێزيك كر، پاشى چەماند .. دا وێ كاغەزێ بخوينت :ـ

«ها ئەڤ كەڤالە ژى ، يێ دەستە سەرە .. كەڤالێ درێژو درێژ ژى يێ دەستە سەرە ، ديارە حەزكرنا خودانى ژى لدوڤ حەزكرنا هندەكێت دىيە..».

بەرى بكەهتە كوژيێ چەپێ ژ هولێ .. كەڤالەكى سەرەنجا وى كێشا : ـ
«ئەڤە چ كەڤالە رەڤدەكا مەيمينكانە .. يێت پارا بسەرێ خو دادكەن و بپەروازەكێ برەنگێ زێرى يێ هاتيە پەروازكرن .. ئەڤى هونەرمەندى تا بارا مەيمينكا ژى يا د پيشانگەها خو ئێخستى .. ئەرێ گەلو ئەڤ كەڤالە يێ هەژى ڤى پەروازىيە ؟.. نێ هەكە يێ هەژى ژى نەبت .. هوسا خودانى يێ حەزكرى .. كەس ژ مە نەشێت مايێ خو د حەزكرنێت وى بكەت .. بەلێ مە ژى هەرو هەر .. حەزكرنێت خو يێت هەين .. زوى بزوى ئەم نەشێن پێلينن و .. هندى ژ مە ژى بهێت نا هێلين كەس پێلێنت».

بەرێ خو ژ وى كەڤالى وەرگێرا .. سەر مێزەكێ لكوژيێ هولێ .. دەست دا قەرەولەكێ پيشانگەهێ وهەلگرت .. قەرەول ڤەكر .. بەرێخودايێ ، بەرێ وى ڤكەڤالەكێ چار هژمار كەت .. هەر هژمارەك لكوژيەكى هاتبو دانان .

قەرەول پێكدادا .. پشتى تبلا شەهدێ يا دەستێ راستێ ، دانايە دناڤ قەرەولى و .. ل وى بەرپەرى و .. تبلا قەليچكێ لگەل هەردوكێت دى ، كەتينە سەر قاما راستى يا قەرەولى و .. تبلا بەرانى كەتيە سەر قاما چەپێ .
لەزكر گافێت خو هاڤێتن .. دا زوى بكەهتە نك كە ڤالێ چار هژمار !؟

ما هويرك د كەڤالى فوكرى .. ديت كو كەڤالەكێ مەزنەو .. لسەر هەر كوژيەكى ديمەنێ كەڤالەكىيە ... لكوژيێ بلندێ راستێ كەڤالێ هژمار (٤٦) بو .. ديمەنێ زەلامەكێ بێ سەربو .. خەنجەرا وى يا رويس كەتبو بەر پێيا .. رهدرێژەكى دەستەكێ تزبيكێت بكولوخا هاتيە چێكرن د دەستادابو .. بزەلامێ بێ سەر دكرە كەنى .

زوى قەرەول ڤەكر .. بەران بەرى وى كەڤالى ئەڤ پەيڤەنە خاندن : «يێ سەر نەبت .. بلا لسەرێ خو بگەرت .. نەكە دێ حالێ وى هەر ئەڤەبت ».

ماوكەتە د هزرێت كەڤالى و وان ئاخفتنادا :ـ «ئەرێ كەلو .. ما مروڤێ بێ سەر .. چەوا دێ لسەرێ خو گەرت .. هەكە سەرێ بێ قالبا .. دبو سەر قالبێ خو گەريابا .. سەر ، هەمى تشتە».

بەرێ خودا كوژيێ چەپێ يێ بلند ژكەڤالێ مەزن .. كەڤالێ هژمار (٢٥) هاتە بەرچاڤا .. چاڤێت وى بديمەنێت كەڤالڤە مانو بو خو گۆت :ـ

«ژنوى ئەزێ ديمەنێت وەسا دبينم .. ئەڤى نێرى وهەردو شاخ .. شاخەكێ وى ديمەنێ ساروخەكێيە .. شاخێ دى ژى ديمــەنێ بالەفـرەكێيە ستێـرەكا لســەر .. ئەڤى زەلامى لسەرێ ڤى چيايى دەستێت خو دانانيە سەر ئێكو .. بەرێ خو ددەتە وێ كچكا هە يا بڤى چيايىدا كەتى وبتاكێ دارێڤە ماى .. لبندا ئەو گولا هەيە .. بەلێ ئاڤا گولێ وەگ خوينێ يا سورە .. ئەرێ ئەڤى زەلامى دەستێت خو يێت دانانيە سەر ئێگ .. بەلێ يێت هە هندەگ زەلامن .. بكارو كوكن .. ژراوستانا وان .. ديارە دڤێن تشتەكى بكەن .. نزانم چ بێژم .. ئەرێ چەوا نێرێيت هوسا هەنە ؟ دەريا ؟ خوينا سور ؟ زەلام بتنێ نەشێت چوبكەت .. دا وێ كچكێ ژدارێ ڤەكەت .. بەلێ زەلامێت دى دتێزكرينە .. دڤێن تشتەكى بكەن ».

بەران بەرى كەڤالێ مەزنو هەر چاركەڤالێت دى لسەر .. متبووزانى كو ئەڤ كەڤالە بخو پيشانگەهەكەو .. هەكە زوى بزوى مروڤ د ڤى كەڤـالى نە گـەهت .. چەوا دێ د هــەمى پيشانگەهێ گەهت .

سەرێ خو بادا .. دا چاڤێ وى بكەڤالى هژمار (٦١) بكەڤت .. ديمەنێ دو زەلامابو .. كارو كوكێ وان يێ كرىبو .. بەرپێك د گرێدا ىبون .. شويتكێت وان لپشتێ بون .. ئێگ بەران بەرى

یێ دی راوستیابو .. بڕەخ دو روباراڤە کێلو بێلانێ دکر .. لهنداڤ وان کەڤرەگبو .. دارەکا دینداری لسەر بو .. رهوریشالێت وێ بکەڤریدا شوربیون .. دەمێ بەرێخودایە قـەرەولی لسەر کەڤالی ئەڤ ئاخفتنە خاندن :ـ «هەر کێلو بێلانێ بکەن .. بـلا دارا دینداری ژی .. رهوریشالێت وێ نە گەهنە چو درا .. رۆژەکێ باوو باروڤە وێ پەلقینن».

زڤری سەر ملێ چەپێ .. کەڤالێ هژمار (٢١) هـاتە بـەر چاڤـا .. دیمەنێ هنـدەگ کەوا درکادابون .. دانابونە دناڤ گڤاندەکێ بلندێ گیای .. لدور رکابو ، وەگ شویتکەکا کەسگ .. کاڤلانێ خەنجەرەکی ژی .. لسەر گڤاندەیبو .. ماوهزرێت خوکرن «براستی ئەڤ هەرچار کەڤالە .. ئەوێت پێکڤە ول سەر ڤی دەیێ داری هاتینە نەخشاندن .. ئەڤ دیمەنە .. رەنگ وسەروبەرێ گوندێ من ددەن .. بەلێ ژ هەمی کەڤالێت د هولێڤە .. هەر ئەڤ کەڤالە بتنێ یێ بێپەروازە .. رەنگێت هەر چار دیمەنـا لگەل رەنگێ دیـواری یێت تێکەلبـین .. پشتی هەر کەڤالەگ ژ وان هەرچارا بخیتکەکا خالێت سور هاتیە پەرجانکرن .

هێش خونێزیکی کەڤالی کر .. دڤیا بزانت کا چ لسەر وی کەڤالی نڤیسیە !؟ بهایێ وی چەندە ؟ بەلێ ژبلی هەر چار هژمارا چو لەسەر کەڤالی نەخاند ..

دلێ وی خوهەلاڤێت : «حەق ژی لسەرنینە .. نزا یێ دەستە سەرە .. دبت گەلەگ کەسادد لێ خودا دەستە سەرکربت .. چ یێ دەستەسەرکربت .. باوەریا من .. هەر ئەوە .. ئەڤ کەڤالە .. بدلێ کەسیڤە نە نوسیایە وەگ دلێ من .

هێدی .. هێدی قەرەول ڤەکر .. لبن کەڤالی ئەڤ تێبینیە خاند :ـ

«لرۆژا هەشتێ لحەفتیا پێنچێ .. ڤی کەڤالیدێ فروشن .. یێ بدرستی حەقێ وی بدەت .. وپەروازەکی بو درستکەت .. وی پیروزبت».

چیرۆك

# ژێر زەمینێکی ئەفسووناوی

**- حیسام حەکیم -**

دەبێ لە زۆر شوێندا لووتت بگریت لە بەربۆنی چڵکاو گۆلەئاوی پەنگاوەو لاشەی بۆگەنی پەنا دیوارەکان ... ماوەیەکی زۆر چاو دەگێری بۆ تروسکاییەك ، کەلەبەرێك .... کەچی هەر ئەوەندە بەرچاووت کەوت ، ئیتر بە خێرایی چاووت دەبەستنەوە یان تۆپەڵە پەڕۆیەك یا چەپەکە قووڕێك دەئاخننە ئەو کەلەبەرەوە ... زۆر جاریش هەناسەت بۆ نادرێت ... شوێنەواری چی ستەمی رۆژگار هەیە بە دیوارەکانیەوە دیارە ، لەگەڵ شێو تاریکیدا دەبن بە تاڵترین دیمەن ...، لێرەو لەوێ چەندچاوێکی سوورهەڵگەراوی دڕندانەت بەرچاوو دەکەوێت ، چاوێکن ... لە دزێوترین و چەپەڵترین دیمەن دەچن ،.. بوونی ئەو جۆرە چاوەو خاوەنەکانیان لەم سەردەمەدا تانەی شەرمەزارین بە ناوچەوانی ...، چاو بگێرە بە هەموو لایەکدا ، لە هەموو شوێنێکدا بەرچاووت دەکەون ، لە سەر دیوارەکان و بەرانبەر پەنجەرەو دەرگاکان و بە درێژایی شەقامەکان و .... و ..... .

گێرزەینە ، ... شاری ترسە .... هاوارکە - ئەگەر دەوێری ، چونکە ئەوەی هاوار بکات ئیتر چاووت پێی ناکەوێتەوە - کەسیش لە دەرەوەی ئەم وێرانەیەدا گوێی لە دەنگت نابێت !، ئەگەر دەنگت بگاتە دەرەوەش ئەوا کەس گوێی لێ ناگرێت !! ...

ئاخۆ چ دەستێك و چارەنووسێکی چەپەڵ ئەو بەستەزمانانەی گیرۆدەی ئەو وێرانەیە کردووە ... ڕواڵەتیان زۆر لە تارمایی دەچێت ، لەبەر ئەوەی زۆربەیان گرفتاری دەستی ئەفسانەی ترسن ، بێئاگایی و ترس کردوونی بە تارمایی ...

دانیشتوانی ئەم ژێرزەمینە داو بە دەستو پێیانەوە بەستراوەو لەلایەن یەکێکی ترەوە دەجولێنرێنەوە ، ئەوەی دەیان جولێنێتەوە داوەکانی دەستوپێی بە دەست یەکێکی ترەوەیەو ، ئەویش .... ، بڕوانە بەردەوام پەژارەو ترسوتوڕەیی بەسەر دەمچاویانەوە بەدی دەکرێت ، هەندێکیان دەمیان دووراوە ... ئەوەیان چاوی بەستراوەتەوە ... یەکێکی تر لە تەنشتیەوە چاوی هەڵکۆڵدراوە !! ...

بیرەوەری تاڵیش بەسەر دیوارەکانیەوە نوسراوەتەوە، (لەم وێرانەیەدا بەختەوەری خراوەتەگۆڕەوە) ئەوی تریان نوسراوە (وەکو کۆمەڵی کەرەستەی بێخواستو ویست دەروێنودێین بەبێهوودە) ، (ئێمە وەکو جەستەیەکی بێگیانین ، کۆمەڵی جڕوجانەوەر لەسەرمان دەلەوەڕێن) ، (لەم وێرانەیەدا هەموو شتێك ئاوەژوبۆتەوەو هیچ ووشەیەك مانای خوێ نابەخشێت) ، (ئێمە لە دایكبوونمانەوە بە مردوو دەژمێردرێن)، (بەرماوە دەخوێنو چڵكاو دەنوشینو لەسەر سەرانگوێلك گوزەران دەکەین) ، (زۆربەمان نووستوینو بێئاگایی ئێمە بۆتەهۆی تەمەن درێژی جڕوجانەوەرەکان) ... لەچاوەکانیدا ستەمو خەفەتی رۆژگار زۆر بەخەستی پەنگاوەتەوە، ... لۆچەکانی دەموچاوی تۆمارگەی کۆمەڵی بە سەرهاتی دڵتەزێنن

...، لەو بڕوایەدابوو کە کەسانێك لەم دەوروبەرە ساردەدا بەزەییان دەبزوێتو ئاوڕ لە گوزەرانی ناسۆرییان دەدەنەوە ... (نازانم بۆچی لە دەرەوەی ئەم وێرانەیە ، لە رۆژهەڵات ،

سەگێك پەلاماری مرۆییەك بدات ... دەڕوانی لە رۆژئاوا دەبێت بەبەزمو ، دەهۆڵ و زوڕنایەکی زۆری بۆ لێدەدەنو نانو پیازێکی چاکی پێوە دەخۆن ! ، یاخود ئەگەر لە رۆژئاوا ئافرەتێك هەڵخلسکێتو پەیخەیەکی بریندار ببێت ... خێرا رۆژهەلات ئەم هەواڵە دەقۆزێتەوەو بە تاوانێکی گەورەی دادەنێتو هەندیجاریش دەبێت بە تاوانی مێژوویی ؟! ... باشە ئەی بۆچی بەرانبەر ئێمە ، قوڕقوشم کراوەتە گوێیانەوەو چاویان کوێربووە ،.. بۆنموونە ئەژدەهایەك لە ناو ئەم ژێرزەمینەی ئێمە هەیە ، رۆژنییە چوارپێنج کەس دانەپاچێتە سەریەکدا ، دوێنێ سەگێکی هار پەلاماری نۆکەسیدابوو ، چواریان مردن !!... بەلام لەهیچ لایەکەوە باسی نەکرا

؟!... وەها دیارە مرۆکانی ئەم وێرانەیە لە دار دروست کراوون !!....) ، هەرچۆنێك بوو پاش

هەولّو تەقەلایەکی زۆر توانی خۆی بگەیێنێتە دەرەوەی ژێـرزەمینەکـە ....، لە دەوروبەری شەقامێکدا چاوی بە خەڵکێکی زۆر کەوت کە سەرگەرمی کاروباری ڕۆژانەی خۆیان بوون ،... ئەوەندەی لە توانای دابوو دەردوخەفەتو بەسەرهاتی کەسانی ناو وێرانەکەی بۆ هەڵرشتن

...، بەلاّم ڕووی خۆیان لێیوەرگێراو ئامادەنەبوون هەر ئاوڕیشی لێبدەنەوە !!، ئنجا حەپەساو ئـەوەندەیتـر تووڕەیی جـەستەی داگـرتو ڕوویکردە دەستـە ڕاستی شەقـامـەکـە ...

(ئێستازانینم، قوڕاوی ئێوەیە ، بەم ڕۆژگارە دەیشێلین ، بەرماوەو دەستاووی ئێوەیە ، بووە بە شیرپەنجە بۆ ئێمە ، شەرم ناکەن باسی ... ؟! لە کاتێکدا کوێرەوەری هەموو ژێرزەمینـەکان دەستکردی ئێوەیە . تاکەی گورگان خواردمان دەکەنو بەرماوەی خۆتانمـان بۆ دەکـەن بە دیاری ؟!...) ئینجا ڕووی وەرگێرا بۆلای کەسانی دەستەچەپی شەقامەکە (ئـەگەر ئـەوان تاوانبارین ، ئەوا ئێوە تاوانەکەتان گەورەترە... چونکە هەموو کاتێ هاواردەکەن ، گوایە ئێوە لایانگری کەسانی نێو ژێرزەمینەکانن‌و ، پشتگیرییان لێدەکەن !! ... بەلاّم بـەپێچەوانـەوە زۆرجار بەپێی بەرژەوەندی خۆتان پارمەتی جرجانەوەرەکان دەدەن ! بەڵێ ... بێشەرمانە یارمەتیان دەدەن !...) ، ڕووی لە هەردوو لایـان وەرگێراو لەبـەر خۆیـەوە تاوتـوێیدەکرد

(نەئەوان‌و نەئەمان دەردی ئێمە تیمار ناکەن ،... پێویستە پشتمان‌بە دەستی خۆمان بخورێنین

... لەلایەکیترەوە ناتوانین بەپێی خواستو ویستی خۆمان هەنگاو هەڵێنین‌و ، داوێکی زۆر بە دەستو پێی زۆربەی دانیشتوانی ژێرزەمینەکەمانەوە بێت ... خۆ دراوسێکەمان خۆی بە خەمخواری کەسانی نێووێرانەکە دەزانێت ، کەچی داوی ڕەنگاو ڕەنگ بە دەستوپێیـەوە بەستراوە !!،... کوڕانی گەڕەکیش زۆربەیان بە هەڵەداچوون ، بەو شێوازەی ئەوان پیادەی دەکەن ، ئەم وێرانەیە نابێت بە نیمچە بەهەشتێك ،... ئەم قوڕەی ئێمە قوڕێکی جیاوازە ....)

**چیرۆك**

عبدالمحسن بني ويس علي

رۆژگاری ئەم چیرۆکە بۆ پەنجاکان دەگەڕیتەوە

-١-

نەك هەرکەسی نەدیبوو بەڵکو کەسیش نەژنەفتبوو کاری خراپێك لە دەسی بکەڤێ بەلاّم هەمیشە دەمی وە خەنگەو بوو وەختی ئەی ماڵو کردو ئەڕا ئەڵوەن چگ وە یەك قەمزەنازێکەو خۆی لەراندەو سەر لە کوڕهجاێلێل شێـوان وتی دویەتی چـواردە ساڵە ، هـەر چەنـد لە سی پەریبـویدەو . کوڕەجاێلێلیش نوای ڕێ لێگرتنو سەر نانەسەری ، یەکی وت : « زەڕینە خۆزگەمەو ئەو کەسە لەبەخڵدا خەفێگ » ئەوی کـەوت « زەڕینە مـاچی بدەپیم » یەکێتروت « زەڕینە لە شووەکەت واز بارو شوو بکەپیم » .

فەرمانی کوی قویخا لە گشتیان زیاتر سەر نا لە سەری هەزارجار زیاتر وتە پێ « زەڕینە بایەتە ڕۆژێ بڕواکنمەد ... خۆزگا شووەکەت بمرێ تا بخوازمەت » .

زەڕینەی باوان ڕمیاگیش نەکرد ڕوو نێگە پیان ! نەئ ، بەڵکو خەنیە دەمیانەو ، وتی نەفت کێگە مل ئاگرا ، زیاتر هانیان داچاوە بڕەکی ئەولیا بکەن .

ژنێل ئاواییش خودا لێان ڕازی بوود ، وەختی یەکەو بگرن هەرچی بهاتاگە دەمیانا ، پوو لەوەم نەخستن . تشتێلی وتن هەر نەبووەو نەکریاس ، گوایا : « بێ حەیاس ، داوان پیسە ، بەد عەمەل کوڕە جایلێل کردیەو لە ڕێ دەریان کردیە ، خونکە ...! » .

دیتر ژنە ، بنیشێگو وەکەیف خۆی خوسپی مەردم بکاتو جەفەنگ بڕسێ ... ئەمجا بزان وەکوو ڕەسێگ !

زەڕینە خۆیشی گشت قسەیەك ڕەسیە گوێی بەلاّم پاپای نەبوو و گوێی لێ نە تەکانو دەربەن هیچ نەبوو . زوراوەی ( زۆراب ) شوویشی جوور « **من چ کارمە** » نە هەی لە وەری کرد ونەیش دەمکوتی مەردم کرد . قەشمەری وەپێ کردنو قسە وەشاننەو بێ . هەرچی قسەی گەنو ناو نەسەق خراپ بوو ، بڕینە پای : « وە چاو خۆی دی ، زوراوە ژنەکەی دەوڵەمەنی کردگە . زوراوە لەبێ خەبەران کەشکە سەلاّمەت ... ! »

زوراوەی بەدبەخت وخەڕگەسەر هەر لە گوڵ سوو تا وە دوای خوراوا تەقەی سەری ئەڕا ماڵی قویخا هات . ولاّخ لە تەویلە دەرکرد جفتیارخستەو ڕێ ، بار ئاسیاو کرد ، بووسان چنیەو ... » لەحاڵ ئەوە نەبوو گۆبەن ئەڕای خۆی دروست بکات .

لە پەنجا پەریبووەو . قویخا ئەڕا ئەوەی لە دەسی نە دەرچدو هەمیشە سوخرە پێ بکات ، زەڕینە ئەڕای خوازیبوو .

زوراوە لە ( زێوای ) خۆشکی بتـرازێ بێ کەس بـوو . کەس نـە زانست لە کووەو هلتیە و لە چ تیرەیەکە . نە خۆی باس کردو نەیش کەسی دەربارەی بنەچەکی پرسیارە لێکرد .

کەس نەزانست زەڕینەیش کوورەیەو کەس‌و کاریشی دیار نەبوو .
وەر جە دە ، دوانزە ساڵ ئەول ئەوەڵ شووەکەیدا هاتبوو و لەی ئـاوایە شوونەو گرتبوون و بوونە وەردەستی لەماڵی قویخـا . بەڵام چـەن ساڵی تێپەڕی شووەکەیلافاوی ئەڵوەن بردەی‌و خنکیا ، دیتر کەس نەزانست چوون قویخا ڕازیی کرد شوو بکاتە زوراوە . زەڕینە وە شیوەیەك سەر لە کوڕە جایلێل شێواندبوو . ئەوقەرە جوانیش نەبوو ، بەڵام لەشی تا بویشی ڕێك‌وپێك و جوان بوو ، ناو قەد باریك و باڵا نەنزم‌و نە بەرز شوێنی زەخمی کوانەیەك وە تێوڵیەو بوو ، دایمەو هەمـدەم دەست لە خوێ‌دا ، دڕەمی دەمی‌و خننەی دەست‌و پای قەت کاڵەو نەبوو . چاوەیلیشی وە سرمـەی عەتار ڕەژی . دڵنگەی وەریشی هەر چەند لە خێرو بەرەکەتی قویخا ژن بوو بەڵام ئەو قەرە شڕ نەبوو ، پرچ‌و پاك بوو ملوانکەی مێخەك بەنێکیش لەملی بوو .

زەڕینەیش وەردەست بوو لە ماڵ قویخا ، لەلا ژنان خزمەت کرد . بێجگە لەوەیش ناو پەچە ماڵی ، ئاو کێشا ، نان‌کرد ، هەر کارێکی تر هن ناوماڵ .

## - ٢ -

ئاوایەکە سی ، سی‌و پێنج ماڵ بوودو کەفێگە بنار گردە بچکۆلەیەك وەو ڕووی گردەکەیا قەیری کەلاوە خرابە بوو . ئەوکەسە لە ئاوایەوە ئەڕا شار بچوگ بایەتە خڕەکەی « کانی قەل » بپەڕێگەو . ڕێەکەی شار دێگ لەناو خڕەکەیـا . خڕەکـە زمسانـان کپ بوو ، سـووزە لە هەر کـووەو بایـگ ناگرێگەی‌و لە تاوسانانیش هەرچی گەرمی بکێگ‌و هەرچەندیش سامەکەی سوور بوود ناو خڕەکە کپەو سێوەریشی هونکەو لەجێ جێکەوە ئاویش تیا

گوڵەم بەسابوو ، هەرچەن ئاوەکەی تۆزێ شۆر بـوو بەڵام خـورا بوو ، مەردومیش تاوسانان خۆیان لەو گوڵەمێلە هونگەو کردن ، ناچاریش تیەنگی شکنێگ . زمسانان لە واران ئەگەر لافاوی بهاتا ڕێەگەی شار بڕێگ خڕەکە جێ ی خاسێك بوو ئەڕا دڵداری . دووسدارێك لەورە وە دزیەو یەکەو گرتن و ڕازانیازی خۆیان ئەڕا یەکتری وتن . ڕۆژێك دنیا بووە خاك و تۆز واکەی فرە قایم بوو . وە ڕادەیەك دارێك لە وەر ئاوای لە ڕیشەیـا هەڵکـەنی . دیتر ئەوقەرە توند بوو وتیم خانگێلگان هەڵگرێگ . خووا نهەبوو ، ئەوقەرە توند بوو شوان وە کەڕەکەو برد لە ئاسمان . وتیم دنیا ژێرو بان کێگ . ناو ئاوای بووە زرمو کوت . تەنەکەو قوتـوو بووەو گـل . کەس نـەتوانست سـەر بکێشێدەو دەر ئەو کەسانەی لە دەرەو بوون وا شپرزیان کردبوو .

لە گێڤەی وا و زرمو کوت و خشـەی دار زیاتـر دەنگ گیـاندارێـك نەژنەفتید تا وە ڕادەیەك سەگیش سووکێ ئەڕا خۆیان پیا کرد بوون . دوای نیمەڕۆ وە زیڕەکەرەکە چما وەتی ئاوای جـوڵە ، لەی وەختە « ئـەڤدکـە وڕی » لەماڵ ئارامی نەگرت ، سوولە کردو چگەو دەر ، خۆیشی نەزانست ئەڕا کوو چووگ . سێنزە چواردە ساڵان بـوو بەڵام ڕەفتـاری هن هەفت ساڵان بوو . جوور گای ناو گوورێل ئەول مناڵە وردگێلا وازی کرد . کەڵپە یەکی ئەڕا تیزکردن ، وت : پوورێك خاستر بوود ! ئەو کێ بکات تا خاستر بوود ! مەگەر خوارزای زوراوە وڕوگێژ نی یە ! هەر ئەو خاڵوی کێگ .

ئەڤدهگە وەختی لەماڵ هاتەو دەر واو تۆز چوونەو پێ کرد قەیرێ وە دەور خۆیا خڕ خوارد ، دواخر پشت لە واگە کرد و ئەولیا کەفتە ڕێ . وا دەڵەکی دا . هەرگامێکی بووە دوو گام . تشتەکە فرە وە پێ ی خۆش بوو . جوور سوار جڵەو وە دەستیەو بوود ، دەس دڕا کردو کردەی لۆقە .

قەیری لەئاوای دوورەو کەفت ، ڕەسیە ناو خڕەکە ، لەورە ڕووەو

ژوورەو بوو تا ڕەسیە لای گوڵەمێك ، خەریك بوو بچەمێدەو و ئاو بخوات ، چاوی کەفتە فەرمان و ژنێك ، ژنەکە کوت وپڕ نیشەو زەوی و لەپشت بەڕێك خۆی شاردەو فەرمان کوچکێ هەڵگرت و وەشانەی وەرەو ئەڤدگە وت :

ــ کەڕی پیس ، منەی چە کەیت ؟ ئەگەر گرتمەت بایەتە هەر دوو گوێت بوورم .

وڕی هەر ئەیە ژنەفت وە چاو پتانێك لە خڕەگە کردەو بان ، دوو پا دایشت دووی تریش قەرز کرد . بێ ئەوەی لا لە تشتێکی تر بکاتەو جوور تیر ئەول واگەیا دەو کرد قەیرێ وە ڕێەکەیا دەوی لە پڕێکا وە دەمەو ڕمیا ، دوارە ڕاسەو بوو ، وەرەو جێ‌ی خەرمانی ئاوای لا دا . وەناو ئەو وەردو درك و دەغەڵ و هەردەی چوڵا دەو کرد تا ڕەسیە کەلاوەکانی پشتی ئاوای . ئەڤدگە لە وەر ترس و شەکەتی ئەو قەرە دڵی کوتا وتی هەمسا لە دەمیەو دەر پەڕێگ وەختی دڵنیا بوو کەسی لە شوونی نی‌یە وە پشت ئاوایا وە لای لوودەکانا تاو دا تا ڕهسیە ورایوەر ماڵی خۆیان لەورە جوور تیرکەمان فڵنگە کرد وە هەسە هەس سڕیا ماڵەو .

ــ ها وڕی ! لە کووەو تیەی ؟ « داڵگی لێ‌ی پرسی » کەی لە ماڵ دەرچیدە ؟ چەدە هەسە هەستە ؟ چما لەسەرت نانە ؟

ــ نە داڵگە کەس لەسەرم نەنایە ، نەوەڵلا م نەکەفتمەو شوێنیان . هە وەپیان نەزانستم ... نەزانستم هات لەورە ...

ــ وڕی چەویشی ! کی ؟! هان لە کوو ؟!

ــ **میمکە زەڕینە .**

ــ میمکە زەڕینە چەیە ؟ ها لە کوو ؟

ــ نیەزانم ، چمان خۆی بوو ... بەلام فەرمان دیم .

ــ **نانەجیم ئەیە چەویشی !**

ــ وە خودا درۆ ناکەم لەورە بوون .

ـ لەکوو بوون ؟
ــ لە ناو خڕەکە . وەخودا خۆم دیمەی ، میمکە زەڕینەیش لە پشت بەڕەکە خۆی شاردەو . هەر خۆیان بوون و کەسی تر ئەولیانا نەبوو .
ــ وڕی بەیە دەمدا ، وەها قسێك بکەی دەمت دڕم ، وەی وا کەسێ لەماڵ خۆی دەر چوود . گوو بخۆو ئاوها قسێك مەکە .
ــ نە داڵگە وە خودا قسە ناکەم و هیچ ناویشم . هیچ نەدیمە داڵگە نادەیدە لیم ؟
ــ نەئ ، نادەمە لید ، ئەگەر دەم خۆت بگری .

ـ ٣ ـ

مەردومی ئاوای تاوسانان لە دەرەو ، لەبان سەکۆ خەفتن بەڵام قویخا لەبان خانگ خەفت . خانگەکەی قویخا لە ناوەڕاست تاوای بووو ڕووی ئەو باخەکە بوو ، وە لا دەس ڕاست و چەپا دوو کۆڵان تەنگ و باریك لە ماڵێل ئاوای جیایەو کرد بوو بەڵام پشتی وە قۆخەڵەکەی زوراوەوە بوو .
ئەو شەوهکیانە قویخا نیاز شار دایشت ، تۆزی زوو لە خەو هەڵساو هێمان وە خەوەو بوو هەر لەبانەو دوو ، سێ دەنگ چرپەو زوراوە بەڵام کەس جەواوی نەداوە وە پارچینەکەیا هاتەو خوارو لەناو هەسارەکە دوو سێ دەنگی تر هەڵاورد بەڵام جەواو نەبوو لە وەر خۆیەو وت :
ــ ئەی قورمساقە ها لو کوو ! وە کووا مل شکاندیە ! پووڕێ هێمان تۆپیەو لەخەو نەهەڵسایە ! بزر خەو کێگ !
دووبارە وە پلەکانەکەیا چگەو بان ، لەبان خانگەکەی خۆیانەو سەر کێشایە ماڵ زوواوەو دەنگ بەرزەو کرد « زەڕینە ، زەڕینە . زوراوە کووە ؟ زهڕینە کە دەنگی قویخا ژنەفت کوت وپڕ هاتەو دەرو لێوی وەخەنگەو بوو

وەت : « **بەڵێ قویخا ئەمرکە** ؟ »

ــ زوراوە لەماڵ نی‌یە ؟

ــ ئەی نەهاتگە ئەڕا ماڵتان ؟! لەماڵ نی‌یە ! نازانم شەوەکی کەی لەخەو هەڵساگە . وەختی م لە خەوا هاتم لە ماڵ نەبوو . لە خوّما هاتگە ئەڕا ماڵتان .

ــ نەخێر لێرە نی‌یە . دەبچوو بزان لای خوشکەکەی نی‌یە ؟

ــ **وەبان چاو** .

ــ زەڕینە ئەوە وت . دوای ئەوەی لە کارو باری خوّی بووەو وە قەمزەو نازەکەی جاران لە ماڵ دەرچی‌و کەفتە کوّلانە دەست ڕاسەکەی ماڵ قویخایا . کوّلانەکە ئەو قەرە تەنگ بوو ئەگەر ولاخ لە وەرەو وە باوەو بهاتا بایەتە پشت بدایتە دیوارەکەوە تا ولاخەگە ڕەد بوواتا . کوّلانەکە تا بویشی پیس و بوو گەن بوو . زەڕینە لە کوّلانەکە دەرچی‌و کەفتە ئاوایا ڕووەو خوار بوو وەرەو ماڵی ( مرای ــ مراد ) . دەست نا وە درانەکەیاو چگە ماڵەو . زێوا پەسا خەویر کرد . دەستی لەناو خەویرەگە بوو . کوڕە فنگەنشینەکەی وەرایوەری دانشتبوو . ڕیپوّق دەور چاوی کرتبوو چڵمیش لە لووتیەو شوّڕا بوو ئەو قەرە مەگەز نیشتبووە دەور دەم و لووتیەو سیەوە کرد . جار جار دەستە بچووکەکەی بردو گنی لە خەویرەکە دەر کرد وەرەو دەمی هاوردەی وەختی دەستی ڕەسیە دەر دەمی مەگەز هژە کرد و هەڵسا وەختی دەست دوورەوە خست دووبارە مەگەز لە شوونەکەی خوّی نیشتەو .

ــ هەی لە زێوا ! ئێرنگە نیشتیە خەویر کێگ ؟ « زەڕینە ئەیە وت و تەماشای کوڕەی زیوا کرد » ئای زێوا باوانت برمێ کوڕەت چەپەڵ خوّی کردگە .

ــ زەڕینە بوومە نەزرت ، شواڵەکەی بکەن و هەر وە پەڕ شواڵەکە بسرەی . خۆت دوینی دەسم گیریایــە . نازانم چــەمان بــوو ، چما وتی ئێمشەو کێشگ کێشایمنە . وەی شەوەکیە دێر لە خەو هەڵسایم .

**ــ زیوا نەك هەر لەیە . ت فرە تەمەڵی !**

زەڕینە ئەوە وت و چگ لە کوڵنانەکە هەفتاوەی ئاو هاوردو کوڕدا لە بن هەنگڵ و بردەی لەنزیك درانەگە شواڵەکەی کەندو پاکیەو کرد .

ــ بوومە قورباند زەڕینە ، دەست دەر نەکێگ ... زەڕینە خێرە چون هاتیدە ؟

ــ هاتمە هەواڵ زوراوە بپرسم . لەماڵ نی‌یەو قویخایش کردیەسەی قاڵ . نازانم وە کوا چکە ؟ سەر لە ئێوە نەداگە ؟

ــ نە وەڵلا . نەهاتگەسە ئێرە . شەوەکی خۆی نەوت ئەڕا کوو چم ؟

ــ م نازانم کەی لە خەو هەڵسیاگە ، وەختی من لە خەوا هاتم لە ماڵ نەبوو .

ــ خێڵ قویخا ، ژنێلیان ئەڕا جیگەیەك کلی نەکردنە ؟

ــ نەخێر ئەگەربوواتا وتن . باوانێگمە چە وەپێ هات !

**« زەڕینە ئەوە وە خونکیەو وت »**

ــ دڵت ورد نەکات وە کووا چووگ ؟ چــۆن دڵ نێگ لە ت دوورەو بکەفێگ ؟

زێوا ئەوە وە تیزەو وتەی بەلاّم زەڕینە پاپای نەبوو چما وایەك بوو و لەبن گوێەی‌دا ، بەلاّم زێوا واز نەهاورد لە نوو لقۆزی تر وەشان :

ــ ئەڤدگە وریەکەی ئێمەیش جار جار گوما بوود . لە واو تۆزکە گوما بوو . لە خڕەگەیش دونیەی ، تا دواخر وەپای خۆی هاتەو .

بەلاّم زەڕینە ئەوەیش هیچ کارە لێ نەکردو هەر دەربەن نەبوو وەت :

ـــ باوانێگته ، ئاوها ڕۆژی چۆن منالْ خۆت وێلْ کەیت ؟ بمینه خێر « زەڕینه ئەوه وتو هەڵسا بچووگه ڕێەو » .

ـــ ها چەبوو هێمان وەختە ؟ نیشتیده .

ـــ نه دالْگم هەر دوو کوڕەم وێڵن و هێمان هیچ نەکردمەو قویخایش هەڵه پەڵەیه ، نازانم چه تواێگ !؟ « زەڕینه ئەوه وت وچیه ڕیەو » .

- ٤ -

**هەشت نۆ مانگ ڕابردو هیچ دەنگێك له زوراوەو نەبوو هەر کەسی جوورێك وت ، یەکی وت « قویخا سەرنگونی کردیه » ئەوه که وت « له خوسەی زەڕینەیا خۆی کوشت »یەکی تر وەت « قویخاو زەڕینه دەس کردنه یەك و لەناو بردنەی » کەڵپه یەکێکیش وت : « له خودا خۆش نایەت ، ئەڕا گونا ئویشین ؟ تا وه چاو خۆتان نه دوینین قسه مەکەن . کی ناویشێ نەوردیەسەی ، یا سەر هەڵگرتیه ، یا نەچگه ئەڕا بەغدا ... » ڕاستیەکەیشی کەس نەزانست جۆنەو چەسه !؟ کەسێك نەبوو بویشی « زوراوه دیمه وەهای کردگه یا وای پێ هاتکه » مەردوم هەرچەند وت گشتی شافه بوو بەڵام هەر کەسێ وه کوێرەی عەقڵ قسه بکردا وت « لەوەر زوڵم و زۆرداری و جەور و جەفای قویخایا سەر خۆی هەڵگرتگه » ئاخرەکەی مەگەر هەر خودا خۆی بزانێ زوراوه چه وه پێ هاتبوو .**

زەڕینەیش له خونکی خۆی نەکەفت « کەس نەزانست هەر خۆی عەیاره ئەڕایه خونکی کێگ یان هەر خودا ئاوها خەڵقی کردگه و خونك نی یەو له مەردوما خونك دیاره » هەر جووری بوو هەمیشه له وەر خەنگەکەی تریوەی دگانێکی هات ، وت شووی وه گوما نه هاتگه . هەر کەسێکیش

هەواڵی شووەکەی لێ بپرسیاگ یا ناوی باورداگ وەدرۆ یا ڕاست مووکی تەر کردو هەناسەی قووڵی هەڵکێسا وت « ئای باوکی ـ سەفەر ـ چاوم کوور بوود باوکی سەفەر » وە هەر جۆری بوو تۆزە تۆزە زوراوە لە هویرەو چگ و تشتەکە کپەو بوو و دیتر کەس باسی نەکردو لە هویرەو چگ . لەی وەختە باسەکەی زوراوە لە هویرەو چگ ژنەی قویخا مرد . قویخا هێمان یەك دوو مانگ نەبوو ژنەی مردبوو دەس کردە دەر و دەشت کردن ، شەوانە لە ماڵ نەما کەس نەزانست ئەڕا کوو چووگ . هامشۆی بەغدای فرەوە بوو ، لە ئاواییش دەمە تەقە ئەول ژنەیلا کرد . ئێوارانیش بان ڕێ لەو ژنەیلە گرت لە ئەڵوەنەو هاتن . ژنەیلی ئاوای زۆرمیان حرمەتدار و خاوەن نامووس بوون و هویچگمیان ڕووی پێ نەیان و هەر زەڕینە نەود وە دەمیەو نەنی و قویخایش دویە لەقی وە دەوریەو کرد . ماوەی نەکێشا مەردوم ڕەسیەو تشتەکە بووە جاجکە خۆشەی دەمی مەردوم ، ئەگەر یەك قسە بوو مـەردوم سێی ناو بانی : « هەی قویخا دڵی ها وە زەڕینەوە قویخا مسایو زەڕینەش . قویخا جوور ژنی خۆی ڕەفتار ئەولیا کێگ !.. » .

قویخا کـوڵە مقن و ڕەنگ زەردو چـووبووە نـاو ساڵەو . مشکی وە سەرەو بەسا ، لەبان زبوونەکەیەو . پەسەکی لەوەری بوو وەختی ئەڕا شار چگ لە باتی پەسەکەکە کوتری کردە وەر و عەبایەك کەلبەدوون زەرد خستەو شان . زەنجیر سەعاتە باخەڵیەکەی وە وەر قەوەکەیا شۆڕا بوو بووە خوارەو قویخا زوانی پیس بوو . هەر لەسەر تشتی بچوك دەس کردە خراو و نفات کردن سەرەڕای زوان پیسی ، کەو زیەڵك بوو . هەر کەسی ڕوو لێ درجەو بکردا زیەڵگ تەرەکاند .

کشت کارێکی نامەر دانە بوو . سێ چوار چڵێس لە دەوری بوو ، وە پشتیان خوڕی و زوڵم لە مەردومی ڕەش و ڕووت کرد ، ئەگەر دەستی بچیاگ

خودای خۆی وه هەق نەناسی ئەگەریش دەستی نە چیاگ بووە پاڵ دم تەکن . فرەیش خود پەرەس و ڕشکن و کژۆژ بوو « سەگی کوور نانێ لە ماڵی نە دەرکرد » کەمچکیشی ها لە کشتقاپێك . شـواڵ پلیتە بـەلام وەختی ژنەکەی لە دنیا بوو نەوێرس ئەی لاو ئەو لا بکێگ . ژنە ڕەحمەت بووەکەی وە حرمەت بوو ، جەڵەوی توند کردبوو و نـەهیشتەی لەو کـارە نزیکـەو بکەفێگ و ئەگەریش بکەفتیاك وە دزیەو کرد ، کەسە پێ نەزانست . چما وتی لە خودا تواست ژنەکەی بمرێ ، کەس نەما هەی لە وەری بکێگ ڕێ ئەڕای چۆڵ بوو ، نە هەیکەر و نە هووکەر .

ڕۆژ وە ڕۆژ قسە دەربارەی قویخاو زەڕینە فرەترەو بوو تا وە ڕادەیەك وتن قویخا زەڕینە خوازێگ . کەس باوەر نەکرد « ئەی چۆن بوود قویخا کەنیزەکەی خۆی بخوازێگ ؟ پیاوەکە هەم قویخاس و هەم دەوڵەمـەنە ، زەڕینە چەس قویخا بخوازیگەی ؟ ڕاسە قویخا شواڵ پلیتـە بەلام نێـوگ بخوازێگەی » سەرە ڕای ئەوە تشتەکە ڕەسیـە ڕادەیەك مـەردوم باوەڕ بکەن . ئێرنگە فرە کەس لەو بڕواس : قویخا زەڕینە بخوازێگ لەوەر ئەوەی بێ نامووسەو کەس ژن نێگە پێ ئەمجایش پیرە .

قویخا داوای سێ چوارێك کرد بەلام کەس شووی پێنەکرد خەڵقی وت : « چـاری ناچـارە ، کەس شـووی پێ ناکـا . هەر بـایەتـە زەڕینە بخوازێگ ، کالا وە قەد بالاس » .

- ٢ -

**ساڵێك زیاترە دەنگ لە زوراوەوە نی یە . ناویشی لە ناوێل نەما . ئێمرۆ لە ناو ئاوای باس هەر باسی قویخا وزەڕینەس . وەخت ئاخرو ئۆخری تاوسانە . ئێوارانێك دیمەنی ئاوای ئەول دمی خۆرو زەردەی خـۆراوایا تـا بویشی ڕەنگـین بوو . ئـاوای ئێواران جـوور شاری**

مووریژە هەلخولیا لە یەك . ڕیەن تێکە بەرگ ولاخ بەسییگەو وەرزز لە سەر خەرمانەو تێگو بۆسانچی لەناو دالیەوە . ژنێل ئەوەی نان کێگ خەریکی تەنوور خستنە . ئەوەی ئەڕا چگە لە ئەلوەنەو تێگو هەر مالێکیش دەولەمەنە ژنەی خەریکی پەز دۆشینە . ژنێك تەنەکەی خولەکوو وە بان شانیەو بوو لەبان سەر کولانەکە خالی کرد ، لەی وەختە ئەڤدگە وڕی لەبان سرکوانەکە خڕ خوارد تەپو تۆزی خولەکوو چکە قوڕگییەو ، دەس کردە قوتەو چەوەیلی فلیقان و لە نوو دەس کردە منەی . منەی تشتی کرد . نەمیەو زەوی تێلێك هەلگرت ، وە دەس ڕاستیەو کردو لەسەرەو جوور ئەلقە چەمانەوەی ، دمی تێلەگە گرتو ئەلقەکەی خست لە چەرخێك وە دەسیەو بوو ، خستیەو گل وە وەر ئاوایا نا دەواتا ڕهسیە نزیکی مالی قویخا . لەورە گتی کردو لە شۆنەکەی خۆی وسیا ، چاوی لە باوکی کەفت ، دەستی کوڕێل خالۆی وە دەستیەو بوو ، لە کولانەکەی لا ڕاستی مالی قویخاوە هاتەو دەر وە وەر ئاوایا ئەڕا مال چگ ، باوکی شان ڕەد کرد ، دوو کەیوانۆ لە کولانەکەوە دەر چگن وزەڕینەی خالۆ ژنی لە ناوەڕاستیان بوو . لە خۆیا ئەوانیش لە شوون باوکی چن بەلام یەکسەر وەرەو درانەکەی مال قویخا کێشانو چگنەو ناو .. ئەڤدکە سەری سڕما « ئەڕا زەڕینە وەی نەوە وەختە چگە مال قویخاوە !؟ » قەیری چاوە ڕێ بوو بەلام کەسێ نەهاتەو دەر خەریك بوو ڕوو وەرچەرخنێگ و بچووگە ڕیەو لەی وەختە چەوی کەفتە فەرمانی کوڕی قویخا لە مال هاتەو دەر ، ئەوقەرە تووڕە بوو ، ئاگر لە دەمچاوی واری ! چاوی کەفتە وڕی ، وڕییش دەمی داچەقابوو .

فەرمان وەختی وڕی دی دیتر یەکجاری چاوەیلی چکەو بان سەری ، نەمیەو کوچکێو وەشانەو ئەڤدگە وت :

٢

**ــ زۆڵی نادرس ، تنیش تیزە پیمان کەیت ؟ شەرت بوود ئەگەر بگرمەد ملت هەڵکێشم .**

وڕی جوور کولله تۆپ فلّنگه کرد له جۆگەکه پەڕیەو وەرەو ڕێەکەی شار . فەرمان قەیری نا له سەری بەلاّم نەگرتەی وواز هاورد . وڕی قەیری دەوی تا له خڕەگه نزیکەو بوو . وەختی زانست فەرمان له ڕاونـانی واز هاوردگه له شوێنەکەی خۆی وسیا ، تەماشای خڕەکه کرد له ڕخا وەخت بوو زیەڵگ بترەکنێگ . دنیا تاریکا هاتبوو . ئەو قەرە ڕخی چگ هەر بنجگێ له بان خڕەکه بوو وه جوانەزماێك قەیری تەماشا کرد دوا خر وەر کردەو ئاوای نەوێرا بچووگەو له فەرمان ڕخی چگ . له نوو تەماشای خڕەکه کرد ، وه یەکجار دی سیاریێك لەناو خڕەکەوه تۆزه تۆزه هاتەو بان . ئەڤدگه له ترسا هەرد قولی هاته لەرزه . دیتر لەشوونەکەی خـوەی نەوێـرا جووڵه بکێگ . مووی سەری جوور سیخوڕ سنگ سنگەو بوو . سیارەکه لەسەر خۆی وه یەواش یەواش هاته وەرەو ، تا ڕەسیه لای ئەڤدکه : ئـەڤدگـه وەختی سیارەکه ناسی گیان هاتەو پێ . وت :

ــ خــ .. خــ .. خالۆ یه خۆتی ؟ یه چەنێکه های له کوو ؟ باوکم ، سەفەرو عەلای برد ئەڕا ماڵ ئێمه و میمکه زەڕینەیش بردنەی ئەڕا ماڵی قویخا . ئا بردنەی ئەڕا ماڵی دوو ژن بردەی !

ــ ئەڕا ماڵی قویخا ؟ ئەڕا بردنەی ئەڕا ماڵی قویخا ؟
ــ بەڵێ ئەڕا ماڵی قویخا . نازانم ئەڕا .

* * *

# فەرهەنگوك

## ئـ

ئەوقەرە = ئەوەندە

ئەول = لەگەڵ

ئیرنگە = ئێستا

## ب

بان = سەرێ

باوداگ = بیهێنابایا

بەڕێك = بەردێك

بەسێكەو = دەبەستێتەوە

بچیاك = بچووبایە

بڕواكنمەد = هەڵتكرم

بكەڤێ = بكەوێ

بكەفێگ = بكەوێت

نبیشێك = دابنیشێ

بوود = دەبێ

بوومە = دەبمە

## پ

پاپانەبوونوبێباكی

پارچینە = پلیكانە

پەسا = خەریكە

پوڕێ = دەشێ

ت

تاوسان = هاوین

تریوه = تریڤه

تواست = ویستی

توایێک = دەیەوێ

ج

جایلێل = لاوەکان

جوانەزما = مێردەزما

جورر = وەکو . لەشیوەی

چ

چگە = چووە

چگ = چوو

چکا = وەکو

چوونەو = ئەوەندە ، بەوڕادەیە

خ

خاس = چاك

خانگەیلەکان = خانووەکان

خەفێگ = دەخەوێ

خوسپ = قسەی خراپ لە پاش ملە

خوڵەکوو = خوڵەمێش

خونك = سوك و ماستاوکەی ژنی بزێو

ـ د ـ

دالیە = بێسان

دایمەو هەمدەم = هەمیشە

دەربەن = دەربەست

دەڵەکیدا = پاڵی پێوە نا

دەو = ڕاکردن

درجەو بوون = مۆرەو بوون

دڵنگ = جل . کەل و پەل

دم = کلك

دووس = دۆست

دویەت = کچ

دوینەی = دیتبوون

دوینی = دەبینی

دیتر = ئیتر

دێگ = دەدا

- ر -

ڕەسیە = گەیشتە

ڕەسیەو = تێگەیشت

ڕەسێگ = دەگا

ڕخ = ترس

ڕشکن = ڕشکی پێوەیە ، ئیدیۆمە واتا پیسکەیە

ڕمیاگیش = ڕوخاویش

- ز -

زەخمێ = برینێ

زیەڵگ بترەکنێ = زارە بترەکنێ

- س -

سام = ڕەشەبای گەرم

سرمە = کل

سووزە = بای سارد ( زستانان )

سوور = کەرم

سووکێك = قوژبنێك

سوولەکرد = سڕبرد

سیار = تارمایی

سیە = ڕڕەش

- ش -

شوال پلیت = ئەوەی بە دوای بێ نامووسیا دەگەڕێ

شووەکەت = مێرەکەت

سوون = شوێن . جیگا

- ع -

عەبای کەلبەدون = عەبایەکی پیاوانەیە کەنارەکەی بە دەزوی زێـڕین دووراوە

- ف -

فلْنگەکردن = مزتەکردن

- ق -

قاب = دەفر

قەیرێ = هێندێك

- ك -

کەلْپەیەکی = هێندیکەس

کهفێگە = دەکەوێتە

کەوزیلْگ = ترسنۆك

کردیەسەی = کردویەتی

کژوژ = پیسکە

کوچك = بەرد

کوو = کوێ

کێگ = دەکا

- گ -

گام = هەنگاو

گرێگەی = دەیگرێ

گنی = پارچەیەك

گوڵ سوو = تریڤەی بەیان

گوما بوود = ون دەبێ

- م -

م = من

مسایۆ = دۆست « عشیق »

میمکە = پورێ

مووك = فرمێسکی درۆکامین

- ن -

نەژنەفتبوو = نەبیستبوو

نەمیەو = چەمایەوە بۆ ئەوەی شتێ هەڵگرێ

نەوێرس = نەدەوێرا

نفات = جوین و قسەی خراپ

نوا = پێش

نوو = نوێ

نێگە = ناداتە

نێوگ = نابێ

- و -

وا = با . هەوا

وە = بە

وەرەو = بەرەو

وەردەستی = بەردەستی . خزمەتکار

وەرقەو = بەسنکی کەوا

ورایوەر = بەرامبەر

ورد = وەسواسی

وسیا = ڕاوەستا

- هـ -

هاتگەسە = هاتووەتە

هەفتاوە = مەسینە

هەڵاورد = دەنگ بەرزەو کرد

هەڵەپەڵە = پەلەکردن

هەڵگرتگە = هەڵگرتووە

هەمسا = ئێستا

هەیکەر = ئامۆژگاری

هەی لەوەر کردن = ئامۆژگاری کردن

هویر = بیر

هێمان = هێشتا

هونگ = فێنك

# چۆن گفتوگۆیەك لە گەڵ «بۆریس باسترناك» ی شاعیردا

● نووسینی : ئاسیا برلین ●

● موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی ●
کردوویەتی بە کوردی

ئێوارەیەکی خۆرەتاوی ی نە سارد نە گەرمی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٥ بۆ سەردانی بۆریس باسترناك چووم . شاعیرو خێزانەکەی و ( لیۆنید )ی کوڕی لە دەوری مێزێکی تەختەدارین لە پشتی ( داتشا )وە کە « خانوویەکی لادێییانەیە » دانیشتبوون . باسترناك بە گەرمی پێشوازی لێکردم . شاعیری دۆستی خاتوو ماریتا تسفتاڤا وای باس کردووە کە لە عەرەبێك دەکات بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە بێت . دەم و چاوی گەنم ڕەنگ بوو ، خەماوی بوو ، بە توندی و بە ئاسایی ، ئەوەی دەردەبڕی ، لە چوارچێوەی وێنەو تابلۆکانی باوکیەوە بە دەنگێکی نزمی یەك سان دەدووا

بەردەوام دەنگێکی تێدا دەهاتە بەر گوێ ، لە چپەو دەنگێکی لەسەرخـۆ دەچوو هەموو کەسێك تەکی‌دا دووابێت بەو چەشنـەی دەناسن ، ئـەو هەموو تیپێـك لە تیپە بـزوێنەکـان درێژ دەکـاتەوە وەك بڵێیت ئـاوازێکی خەماوی‌ی ئۆپرای چایکۆفسکی‌یە بەڵام توندترو بەهێزتر .

پێ‌ی‌گوتم : « لە ئنگلتەرەوە هاتوویت ، من لە سی‌یەکان‌دا لە ساڵی ١٩٣٥دا لە لەندەن بووم ، ئەویش لە ڕێگەی گەڕانەوەمدا لە پاریسەوە کە کۆنگرەیەکی نووسەران دژ بە فاشیزمی تێدا بەسترا » ، پاشان ووتی لە هاوینی ئەو ساڵەدا کوت‌وپڕ تەلەفۆنێکی بۆ کـراوە تێیدا داوای لێ‌کـراوە ئامادەی کۆنگرەی نووسەران ببێت کـە گورج لە پـاریس دەبەستـرێت . ئاگاداری کردن کە جل‌و بەرگی شیاوی نی‌یە ئامادەی کۆنگرەکە ببێت ، لێپسراوان پێ‌یان گوتووە ئەو کارە لە ئەستۆ دەگرن . پاڵتاوێکی ڕەسمی‌و پەنتۆڵێکی هێڵ‌دارو کراسێکی یاخەداری باڵدرێژو پێلاوێکی شیاویـان بۆ نارد .

بەڵام لە ئەنجامدا توانی‌ی کەل‌وپەلە ئاسی‌یەکانی خۆی بپۆشێت . پاشان زانی‌ی کە مالرۆ ، دامەزرێنەری کۆنگرەکە ، لەسەر بانگ‌کـردنی سووربووەو دەستەڵاتدارانی سـۆڤیەتی‌ی ئـاگادار کـردووە ئەو لەگـەڵ ئەوەی کە دەزانێت کە ئارەزوو ناکەن باسترناك تەك ئەو وەفدە سۆڤیەتی‌دا بنێرن ، بەڵام ئەو ، واتە مالرۆ ، وا دەبینێت کە ئامادەنەبوونی باسترناك‌و بابل بۆ پاریس دەبنە هۆی ڕوودانی شەرمەزاری‌یەکی وا کە پێویست ناکات ڕوو بدات بەوەی دوو نووسەری زۆر ناوداری سۆڤیەتن ، لەبەر ئەوەیش کە زۆر لە چەشنی ئەوان نین لەوانەی نوێنەری لیبرالی‌یەکانی ئەوروپا بن .

باسترناك ووتی : « نازانیت چەند لەو خەڵکە نـاودارە تۆقێنـەرانە

ئامادە ببون ، لە چەشنی دریسیَو ، جیدو ، مالرۆو ، ئـەراگۆن و ئـۆدن و فۆرستەر و ڕۆزا مۆند لیمان » .

« وا باوەڕ دەکەم قسەکەم لە کۆنگرەکەدا واقی ووڕکردن ، بەلاَم دەتوانم چی شت بلێم جگە لەوەی ووتم . وای بۆ چووم کە دەگەڕیمەوە وولاَت تووشی هەندێك کۆسپ و تەگەرە دەبم ، بەلاَم هیچ کەسێك قسەیەکی بـە ڕووم دا نەدا . لەسـەر پشتی یەکێـك لە کەشتی یـەکـانمـان تـەك شرباکـۆفدا بۆ نیشتمـان گەڕامـەوە ، ئەو ئـەو سەردەمـە سکرتێـری یەکیەتی ی نووسەران بوو ، پایەکەی کاریگەر بوو پاشان بوو بە ئەندامی نووسینگەی ڕامیـاری . شەوو ڕۆژ دەدووام ، لیّم دەپـاڕایەوە نـەختێك بیّدەنگ بم تا بنویّت . بەلاَم هەر دەدووام . پاریس و لەندەن لە خەویان هەلَساندم و ئیتر نەمدەتوانی لە دووان ڕابوەستم . لیّم پاڕایەوە بەلاَم من گویّم پیّنەدا . دەبیّت وای زانیبیّت کە ئەقلَم لە دەست داوە » .

پاشان باسترناك لیّی پرسیم سەبارەت بـەوەی شتێکم دەربارەی پەخشانی خوێندبیّتـەوە ، بەتـایبەتی « منـدالَیەتی ی لۆفیّـرز » ، ووتی « دەتوانم ئەوە لە دەربڕینەکانی دەم و چاوتـەوە بزانم » . ئـەنجا ووتی لەسەر هەق نییت « ئەو نووسینانە بە دروستکراو بە هەلَبەستراو ، بـە خۆیی و ، نویّ و خیّرا دابنیّیت ، نا .. نا .. پیّی لیّنیّ . تۆ بەڕاستی وای دادەنێیت .. هەقی خۆتە وای دابنیّیت . خۆم لیّی شەرمەزارم . لە شیعری من نی یـە بەلَکـوو تەنیـا لە پەخشـانی منە . من لاوازتـرین بەرهـەمی بزووتنەوەی ڕەمزی و زۆرترین شلَەژاوی ی کە لەو سالاَنەدا باو بوو کە پڕ لە تەم و مژ و هەرچی و پەرچی بوو کاری تیّکردبووم . ڕاستت دەویّت ئەندریّ بیّلی بلیمەت بوو ، بەلاَم کارتێکردنـەکەی دلَتـەزیّن بوو . کـەچی جویّس جوداوازبوو ـ هەموو ئەوەی ئەو کاتە نووسیبووم ، خۆیی ، سەپیّنراو و

ووردو خاش‌و هه‌ڵچووانه بوو سوودی نه‌بوو به‌ڵام ئێستا شتێکی به‌ته‌واوه‌تی جوداواز ده‌نووسم ، شتێکی نوێ ، به ته‌واوه‌تی نوێ ، ڕووناك‌و به‌رزو ڕێك‌و پێك‌و کلاسی ی ئاشکراو ساکار ، ئه‌وه‌ی که وونکلمان‌و گۆته ده‌یانویست . ئه‌م کاره‌یش دووا ووته‌ی منه . گرنگترین ووشه‌ی منه بۆ جیهان . ئه‌و شته‌یه ، به‌ڵێ ئه‌و شته‌یه که ده‌مه‌وێت پێ ی ناوم ببه‌ن . پاشماوه‌ی ژینی خۆمی بۆ ته‌رخان ده‌که‌م .

ناتوانم به ته‌واوه‌تی شاڵاوی ووشه‌کانم به‌یاد بێته‌وه به‌ڵام به‌م چه‌شنه قسه‌که‌م یاد که‌وته‌وه . پرۆژه‌که‌ی که لێوه‌ی ده‌دووا ڕۆمانی « دکتۆر زیفاکۆ » بوو . ده‌ستنوسی به‌شه‌کانی سه‌ره‌تای ئه‌و ڕۆمانه‌ی ساڵی ١٩٤٥ ته‌واوکردبوو ، داوای لێکردم بیانخوێنمه‌وه‌و پاشان بۆ خوشکه‌که‌ی بنێرم له ئۆکسفۆرد . منیش ئه‌و کاره‌م‌کرد به‌ڵام به پرۆژه‌ی ڕۆمانه‌که‌م نه‌زانی وه‌ك کارێك ته‌واو پاش ئه‌وه نه‌بێت به ماوه‌یه‌کی دوورو درێژ . پاش ئه‌وه باسترناك بۆ ماوه‌یه‌کی زۆر بێ‌ده‌نگ مایه‌وه‌و ، که‌سمان ده‌ستمان به قسه نه‌کرد . پاشان باسی بۆ کردین چۆن جۆرجیاو نووسه‌ره جۆرجی‌یه‌کانی خۆش ده‌وێت ، وه‌ك یاشیفین و تاییدزو مه‌ی‌و شه‌رابی جۆرجیا . هه‌روه‌ها چۆن هه‌موو جارێك بۆ ئه‌وێ بڕوات به گه‌رمی‌یه‌وه پێشوازی‌ی لێ‌ده‌که‌ن . پاشان به ئه‌ده‌به‌وه پرسیاری ئه‌و ڕووداوانه‌ی لێکردم له ڕۆژئاوادا ڕوو ده‌ده‌ن‌و ، ئایا هربه‌رت ریدو بیرو باوه‌ڕی « که‌سانیه‌ت » ی ده‌ناسم . لێره‌دا بۆی ڕوون کردمه‌وه که تێگه‌یشتنی ئه‌و له سه‌ربه‌ستی ی که‌سایه‌تی له‌سه‌ر تاکه که‌سی ی کانتیه‌ت دامه‌زراوه‌و بلۆك له تێگه‌یشتن له کانت به ته‌واوه‌تی به‌هه‌ڵه‌دا چووه له هۆنراوه‌ی « کانت » دا . هیچ شتێکیش نه‌بوو بتوانێت ده‌رباره‌ی ڕووسیا بۆم باس بکات ( ئه‌وه سه‌رنجی ڕاکێشام که باسترناك‌و ژماره‌یه‌کی تری نووسه‌ران

هەرگیز ووشەی یەکیەتی ی سۆڤیەتیان بەکارنەهێنا ) .

هەندێك جار لەسەر خۆی دەدووا ، پاشان ڕەهێڵێکی خێرای ووشەی زۆری بەکاردەهینا ، بگرە لە سنووری دەستووری زمان لای دەدا بەم جۆرە دەدووا ، چەند ماوەیەك لەسەری دەڕۆیشت پاشان ماوەیەکی توندی بە دووادا دەهات بەڵام پڕ بە وێنەی تەواو زۆر ئاشکرا بوو ، ئەنجا ووشەی تاریك کە نەدەتوانرا تەکیدا درێژە بە قسەکردن بدرێت ئەنجا کوت وپڕ بۆ زمانی ئاشکرا دەگەڕایەوە . بەردەوام قسەکانی قسەی شاعیر بوون ، هەروەها نووسینەکانی ، یەکێکیان جارێك ووتبووی شاعیرانێك هەن کە شیعر دەنووسن شاعیرن و ، نووسەرانی پەخشان کە پەخشان دەنووسن ، شاعیرانیش هەن هەرچییەك بنووسن هەر شاعیرن . باسترناك شاعیرێکی بلیمەت بوو کەو بەرهەمانەی پێشکەشی کردبوون . سەباروت بە قسەکانی ، تەنیا کەسێك کە وەك ئەو دەدووا : فیرجینیا وولف بوو ، کە وای لە مێشکی گوێگر دەکرد کێ بەرکێ ی تەك دا بکات و بۆچوونی ئاسایی گوێگری سەبارەت ڕاستی دەسڕی یەوە ، بە شێوازی دڵ خۆشکەرانەو ، هەندێك جاریش بە شێوازی تۆقێنەرانە .

بە ئەنقەست ووشەی ( بلیمەت )م بەکارهێنا لێرە زۆر جار لێم دەپرسن مەبەستم لەم ووشە زۆر سەرنج ڕاکێشەرەو ناڕێکە چی یە . بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەتوانم یەك شت بڵێم جارێکیان لە نیجینسکی ی سەماکەر پرسیاریان کرد چۆن لە توانایایە تا ئەو بەرزایی یە باز بدات کە بازی بۆ دەدات ! لیوەی دەگێڕنەوە کە بەم جۆرە وەڵامی داوەتەوە ، کە ئەو لە ئەنجامدانی ئەو شتەدا گرانی یەکی ئەوتۆ نابینێت . زۆربەی خەڵکیش کە باز دەدەن گورج و ڕاستەوخۆ دادەبەزنە زەوی « بۆ

ڕاستــەوخۆ دادەبــەزیت ؟ تۆزێـك بە ئـاسمانــەوە بمێنــەوە بــەر لەوەی دابەزیت ، بۆچی نا ؟ » لەبەر ئــەوەیە بــۆم دەردەکەوێت کــە یەکێـك لە پێوانەکانی بلیمەتی توانابوونی بەدیهێنــانی شتێکە بــە ئاشکــرایی و بە ساکاری ، شتێك کە کەسانی تر ناتوانن بەدیی بهێنن ، خــۆشیان ئــەوە دەزانن ، باسترناك هەندێك جار بە بازدانێکی گەورە دەدووا ، بەکارهێنانی ووشــەکانی لەلایــەنی ئەوەوە زۆرتــر لەوەی بیستبووم خــەیاڵیبــوو زۆر توندوتیژو کاریگەر بوو . بێگومان ژمارەیەك لە بلیمەتەکانی جیهان وەك جــوێس و ئەلیــۆت و ییێتس و ئۆدن و ڕاســل وەکــوو ئــەو نــەدووان « وەك ئاگاداریانم » ، ناشمەوێت شتەکە گەورە بکەمەوە ، بــەلام کە شــاعیرم بــەجێهێشت ووشەکــانی کاریتێکــردبووم و کــەسایــەتی ی ســەرنجی ڕاکێشابووم .

پاش ئەوەی باسترناك بۆ موسکۆ گــەڕایەوە ، بــەلایەنی کــەمەوە هەموو هەفتەیەك سەرم لێدەدا ، بەم جۆرە زۆرترم ناسی ـ ناتوانم بیر لە هــەوڵدانی باسکــردنی کــارتێکــردنی ئــامــادەبــوون لەبــەردەمی داو ، دەنگی و ، نیشانەو هیماکانی بکەم ، سەبارەت کتێب و نووسەران دەدووا ، حەزی لە برۆست دەکردو نووسینەکانی تێرو تەسەلی کردبوو ، هەروەها بیــۆلیســز ، هــەر چــۆنێکیش بێت دوایــەمــین شــاکــارەکــەی جــوێسی نەخویندبووەوە . دەبارەی ڕەمزییەتی فەرەنسایی و فرهارن و ڕیلکە دووا ، چاوی بە هەردووکیشیان کــەوتبوو ، ڕیلکــە وەك نووســەرێك ســەرنجی ڕاکیشابوو ، وەك مرۆڤێکیش هەروەهــا شکسپیریش کــاریتێکردبــوو ، وەرگێــڕانەکــەی قایــلنەبــوو ، واتە وەرگێــڕانەکــەی شکسپیر لەلایــەن باسترناکەوە ، « هەولم دا سوود لە شکسپیر وەربگرم بەلام سەرنەکەوتم » هەروەها ووتی لە سێبەری تەلەستۆیدا پەروەردە بووم کە بە بلیمەتێکی

ئەوتۆی دادەنێت هاوشانی نەبێت . بەمەزنترلە دیکەنزو دەستۆفسکیی دەزانیو شـان بە شـانی شکسپێرو گـۆتەو پـۆشکینی دادەنا ، بـاوکی وێنەکێشی « هونەرمەندی » لە ساڵی ۱۹۱۰ دا لەگەڵ خۆیدا بردبووی بۆ دوایەمین جـار لە تەرمی تـەلەستۆی بـڕوانێت لە ئەستـابۆڤـۆ . دەرکی بەوەیش کردبوو کە ناتوانێت هەڵویستێکی ڕەخنەیی بەرانبەر بەتەلەستۆی دیاری بکات : چونکە تەلەستۆیو ڕووسیا یەك شت بوون ، سەبارەت بە شاعیرانی ڕووسیش ، بلۆك ، بلیمەتی دەست ڕۆیشتووی چەرخی خۆی بوو ، بەلاّم وای دانەدەنا کە بەسـۆز بێت ، بیلیی لەلا پـەسەنـدبوو ، شاعیرێکی ئەندیشە سەیری نویّ بـوو ، ئەنـدیشەکـانی ئەفسـووناوی بوون ، هەروەهـا ئاسـایی بوون لە تێـڕوانینی ئاسـاییانـەی ڕۆسیای ئـەرسەزۆکس . بـەلاّم ، باستـرناك ( بـریۆسـۆڤ )ی بە بـیر تەسـكو نادا هێنەرو ، سنووقێکی مۆسیقای ئامێر دەزانی ، ژمێریارێکی سەرکەوتوو بـوو نەك شـاعیر ، بـاسی ( مانـدلشتام )ی نـەکرد ، بـەلاّم هەڵویستی بـەسۆزانـە بوو سـەبارەت خـاتوو شـاعـیر مـاریـانـا تسفتـاڤـا ، کـە دۆستایەتییەکی دوورودرێژی تەكدا هەبوو .

هەستو نەستی بـەرانبەر بـە مایـاکۆفسکی پتـر دۆستانـە بوو ، بەچاکی ناسیبووی ، دوو برادەری زۆر دۆستبوون ، لێوەی فێر دەبوو ، چونکە مایاکۆفسکی ، لەڕاستیدا ، ڕووخێنەرێکی دەستڕۆیشتووی شێوە کۆنەکان بوو ... بەلاّم ، هێشتا قسەکە هـەر هی ( باستـرناك )ە ، بـە پێچەوانەی باوەڕدارەکانی ترەوە ، هەموو کاتێك هەر مرۆڤ بوو ، کەچی شاعیرێکی مەزن نەبوو . خواوەنـدێکی نەمـری وەك نیوچێڤ یـان بلۆك نەبوو . بگرە نیوچە خواوەندیش نەبوو وەك فیت یان بیلی . کاتو سەردەم سڕیبوویەوە . بوونی ئەو لە قۆناغی خۆیـدا پێویست بـوو . ئەو وەلاّمی

پێویستی ی قۆناغی خۆی بوو . چونکە شاعیران هەن شاعیری کات‌ودەمی خۆیانن ، وەك ئاسییێ‌و ( کلیۆییف )ی بەستەزمان ( کە کوژرا ) ، لەگەڵ سلافنسکی‌و بگرە ( یەسەنین )یش . وەلاّم دەرەوەی پێداویستی‌یەکانی قۆناغی خۆیان بوون . بەهرەکانیان زۆر گرنگ بوو بۆ پەرەپێدانی شیعری وولاّتەکەیان ، بەلاّم نەك لەوە پتر ، کە مایاکۆفسکی مەزنتری ئەوانە بوو . چامەکەی ( هەورێك لە شەروالێك‌دا ) نرخی مێژوویی خۆیی هەیە ، بەلاّم هاوار کردنێکی ئەوتۆ بوو بەرگە نەدەگیرا . بەهرەکەی زل‌کردبووەوەو بە چێژی کردبوو تا تەقی‌یەوە ، ئەو پارچە کاغەزە غەمبارانەی ئەو باڵونە رەنگاورەنگە هێشتاکە لەسەر رێگای هەریەکە لە ئێمەمانان‌دا بەردەبنە خوارەوە ، ئەگەر ئەو یەکە رووسی بێت . مایاکۆفسکی بەهرەوەرو گرنگ بوو بەلاّم پێ‌نەگەیشتوو و بێزراوبوو بە هونەرمەندێکی پۆستەری دیوارکۆتایی پێ‌هات . هەروەها پەیوەندی‌یە دڵداری‌یەکانی نەگبەتی‌یەك بوو رووی تێ‌کردبوو وەك شاعیرو وەك مرۆڤ . باسترناك ، مایاکۆفسکی ی زۆر خۆش دەویست‌و رۆژی خۆکوشتنی ئەمی دوایی غەمبارترین رۆژی ژیانی باسترناك بوو .

باسترناك نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزی رووسیا بوو ، هەستی بە پەیوەندی‌یە مێژوویەکانی تەك وولاّتەکەی زۆر قووڵ بوو . چەندین جار ئاگاداری دەکردەم چەندی پێ خۆشە هاوین لە گوندی ئەدیبان بیریدلکینۆدا بەسەر ببات ، چونکە بەشێکی ناوچەی ئەو سلاڤۆبیلی‌یە مەزنە یۆری سامارین بوو . ئارەزووەکەی دڵسۆزانە بوو تا رادەی عەبدالّبوون ، لەوەدا کە کەسانی‌تر بە نووسەرێکی راستەقینەی رووسیایی بژمێرن رەگ و ریشەی لە خاکی رووسیادا قووڵ داکوتابێت ، ئەو ئارەزووە ئاشکراو دیاربوو بەشێوەیەکی تایبەت لە هەست‌و نەستە سەلبی‌یەکانیدا بەرانبەر

بە ڕەچەڵەکی جووانەی . نەیدەهێشت ئـەوە باس بکـرێت ، نەك لەبـەر ئەوەی تەنگی پێدەهێنا ، بەڵام لەبەر ئەوەی بە تەواوەتی ڕقی لەو شتە بوو . ئاواتی ئەوەبوو جوو بە تەواوەتی نەمێنن .

چێژی دەوڵەمەندی باسترناك لە گـەنجێتی ی دا پێك هـاتبوو ، بـە دڵسۆزی ی گەورە هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمە مـایەوە . بیـرەوەری ( سکـریابـین )ی زۆر لا پیرۆز بـوو . خـۆشیی بیـری لەوە دەکـردەوە مۆسیقارێك بێت . ئەو پێداهەڵدانە بەرزەم لە یادناچێت کـە باستـرناكو نیوهاوس بەرانبەر بە سکریابینو هونەرمەندی ڕەمزی فرۆبیل ووتیان کە هەردووکیانیان لەگەڵ نیقۆلا ڕۆرچ دا بە چاکترین هونەرمەندی هاوچەرخ دادەنێن .

باوەڕ وایە کە شاعیر خاتوو ئەخماتۆڤاو ، ئەوانی سەردەمی ئەو ، گۆمیلێڤو مارینا تسفتاڤا ، ئەوان دوا دەنگی مەزن بوون کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوتن ـ لەوانەیشە باسترناكو ( مـاندل شتـام )یش ، قۆناغی ناوەڕاستی هەردوو سەدەکەیان پڕ کردبێتەوە . دوا نوێنەری ئەوە بـوون کە پێی دەگـوترا دووەمـین ڕاپەڕینی ڕووسی ، کـە لە بنەڕەتدا پیکاسۆو سترفنسکیو ئەلیۆتو جویسو شوتنبرگ کاریان تێنەکردبوو ، ئـەگەرچی سـەرنجی ئەمیـان ڕاکێشابـوو .. باستـرناك ڕووسیـەکـانی خۆش دەویست ، بەشداری ی هیواو ترسو خەونەکانی دەکردن . ویستی دەنگی ئـەوان بێت ، وەك لەوەوپـێش تیـۆچـیڤو ، تـەلەسـتـۆیو ، دۆستەیەفسکیو ، چیخەفو ، بلۆك بەو جۆرەیان کرد هەر کـەسەو بـە شێوازی خۆی .

لە یەکێك لە گفتوگۆکانیدا تەك مندا ، لە کاتی سەردانم بۆ مۆسکۆ کاتێك بە تاكو تەنیاین ، لەدەوری مێزێکی بریقەداری وا کە هیچ کتێبو پارچە کاغەزێکی لەسـەر نەبێت ، زۆر جـارو بەردەوام ئـەوەی دووبارە

دەکردەوە کە ئەو لە تەنیشت دڵی نیشتمانەکەیەوە ژین گوزەران دەکات . بە سوور بوونەوە بەردەوام ، نارەزایی دەربارەی ئەو ووردەکاری یە دەردەبڕی ، کە گۆرگی و مایاکۆفسکی ، بە تایبەتی یەکەمیان ، هێنا بوویانە ئاراوە . هەستی بەوە دەکرد کە شتێکی پێیە دەیەوێت بە لێپرسراوانی وولاتەکەی ڕابگەیەنێت . شتێکی زۆر بە بایەخ ، کەسی تری جگە ئەو ناتوانێت بیلێت ، ئەگەرچی ئەوەی کە دەیەوێت ڕاییگەیەنێت ، کە زۆر جار لێوەی دەدووا ، بۆم دەرکەوت کە تەمو مژو نەزانراوە لەوانەیە ئەوە بەهۆی ئەوەوە بوو کە لێی نەدەگەیشتم ، ئەگەرچی ئانا ئەخماتۆڤا ئاگاداری کردم کاتێك ئەو بەو ووروژاوی یە پێغەمبەری یانە دەدووا ، ئەویش هیچی لێ تێنەدەگەیشت .

لە یەکێك لەو نۆرە تیشك دانانەوەدا ، باسترناك ڕووداوی تەلەفۆن بۆ کردنە بەناوبانگەکەی بۆ گێڕامەوە کە ستالین بۆی کردبوو دەربارەی گرتنی ماندلشتام کە ئەو تەلەفۆن بۆکردنەیە ئەوساو ئێستایش دەربارەی قسەدەکرێت ، دەتوانم ئەوەی ساڵی ١٩٤٥ وەك لەیادم بێت ، بگێڕمەوە . ووتی لە شوقەکەیدا بوو لە مۆسکۆ لەگەڵ ژنەکەی و کوڕەکەیدا بە تەنیا ، کاتێك تەلەفۆنەکە لێیدا ، دەنگێك ئاگاداری کرد کە کەرملین لەسەر تەلەفۆنەو ، هاوڕێ ستالین دەیەوێت تەکیا بدوێت . باسترناك وایزانی گاڵتەیەکە یەکێکیان دەیەوێت پێی بکات ، مایکرۆفۆنەکە لەشوێنی خۆی دادەناتەوە . بەلام تەلەفۆنەکە جارێکی تر لێیدایەوە ، ئەم جارە دەنگەکە هەرچۆنێك بوو قایلی کرد ، کە تەلەفۆن بۆ کردنەکە ڕەسمی یە ، پاشان ستالین لێی پرسی ئایا تەك بۆریس لیۆنیدیڤچ باسترناكدا دەدوێت . باسترناك ئاگاداری کرد کە خۆیەتی ، پاشان ستالین لێی پرسی ئایا ئەو ئامادەبووە کاتێك ماندلشتام چامەیەکی خوێندووتەوە تێیدا هەجوی ( ستالین )ی کردووە . باسترناك وەلامی دەداتەوە کە ئەو هیچ گرنگی یەك

لەوەدا بەدی‌ناکات ئامادە بووبێت یان نا . ئەو لەوپەڕی شـادومانیـدایە چونکە ستالین تەکیا قسە دەکات‌و ، ئەو دەیـزانی کە ئـەو شتە ڕۆژێـك ڕوودەدات . ئەوەی دەزانی کە دەبێت هەردووکیان بـەیەك بگـەن‌و تەك یەکتری‌دا بدوێن . دەربارەی شتی زۆر بە بایەخ بدوێن . پاشان ستالین لێ‌ی‌دەپرسێت ئایا ماندلشتام شاعیرێکی گـەورەیە . بـاسترنـاك وەڵامی دەداتەوە کە ئـەو بە تـەواوەتی لە مانـدلشتام جـوداوازە ، ئەو ، واتـە باسترناك ، شیعری ماندلشتام سەرنجی ڕادەکێشێت بەڵام هەست بەوە ناکات کە پەیوەندی‌یەك لە نێوانی ئەوو نێوانی شیعـری ئەوی دوایی‌دا هەبێت ، بەڵام ئەوە هەموو ، هەرچۆنێك بێت ، مەسەلەیەکی گرنگ نی‌یە .

لێرەدا ، کە باسترناك دەگاتە ئەم بەشەی بەسەرهاتەکە ، یەکێك لە تێکەوتنە میتافیزیکی‌یەکانی سەبارەت بە خاڵەکانی وەرچەرخان لە مێژووی جیهان‌دا دەست‌پێ‌دەکات ، ئەمە ئەو باسانە بوون کە باسترناك ویستی تەك ستالین‌دا دەربارەیان بدوێت . ئەم شتەیش بۆ ئەو زۆر گرنگ بوو . دەتوانم بە ئاسانی بیهێنمە خەیاڵی خۆمەوە چۆن لەگەڵ ستالین‌دا بەو جۆرە دەدووا . هەرچۆنێك بێت ستالین دووبارە پرسیـاری لێ‌کردبـووەوە ئایـا ئامادەبووبێت کاتێك ماندلشتام چامە هەجووکەرەکەی خوێندووەتـەوە ، باسترناك قسەکـەی خۆی دووبـارە کردووەوە ، شتی زۆر گـرنگ بـەیەك گەیشتنیە تەك ستالین‌دا ، کە دەبێت خێرا ئەنجام‌بگرێت‌و ، هەموو شتێك لەسەر ئەو بەیەك گەیشتنە ڕادەوەستێت‌و ، دەبێت هەردووکیان بدوێن‌و ، دەربارەی شتی زۆر گرنگ بدوێن ، دەربارەی ژیان‌و مردن ، ستالین وەڵامی دەداتەوە : « ئەگەر هاوڕێ‌و برادەری ماندلشتام دەبووم ، دەمزانی چۆن بە شێوەیەکی باشتر داکۆکی‌ی لێ‌دەکەم » ئیتر تەلەفۆنەکە دادەخات .

بـاسترنـاك هەوڵ‌دەدات جـارێکی‌تر تـەلەفۆن بکـاتـەوە ، بـەڵام بەبێ‌هوودە . ئەم ڕووداوە ، وەك چۆن ئاشکراو دیاربوو ، کارێکی قووڵی

کردە سەر باسترناك . لەوەوپاش بە لایەنی کەمەوە دووجـار بۆی بـاس کردووم‌و بۆ کەسانی دیکـەیشی گێڕاوەتـەوە ، بە شێـوەیەکی ئـاشکرای جوداواز . بەلاَم هەر هەستی بەوە دەکرد کە بە شێوەیەکی دیکە ڕەفتاری کردبایە ، لەوانەبوو یارمەتی‌ی شاعیری برادەری بـدایەت ( ئـەوە بوو ئەخماتۆڤاو نادزدا ماندلشتام لەسەر ئەوە قایل‌بوون چوار لە پێـنج پلەی پێ‌ببەخشن لەسەر ئەم مەسەلەیە ) .

پاش ئەوە بە یازدە ساڵ ( باسترناك )م نەبینی . لەگەڵ نیوهاوسی برادەری‌و یەکێك لە کوڕەکانیدا لە یەکەمین ئافـرەتی کە ئێستـا خێزانی ( بـاسترنـاك )ە چووم بـۆ سەردانی . نیـوهاوس زۆر جـار دووبـارەی دەکردەوە کە باسترناك وەلی‌یەو ، وەك پێویستە دنیایی نی‌یەو ، توانابوونی بلاَوکردنەوەی ڕۆمانەکەی « دکتۆر زیفاکۆ » ڕێ‌ی تێ‌ناچێت ...

بـاسترنـاك بۆ نـووسینگـەکـەی خـۆی بـردم‌و ، لەوێ زەرفێکی ئەستووری پێ‌دام‌و گوتی : «ئەمە کتێبەکەمە . هەموو شتێك لێرەدایە . ئەمە دووا ووشەی منە ، تکـام وایە .. بیخـوێنیتەوە » . بـۆ سبەینێ .. « دکتۆر زیفاکۆ »م خوێندەوە .. کە دووبارە بینیم لێم‌پرسی نیازی چی‌یەو چی پێ‌دەکات . ووتی کە بە بلاَوکەرەوەیەکی ئیتالیایی داوە .. ئارەزووی دەکرد ئەم ڕۆمانەی ، کتێبی پیرۆزی ، زۆرترین کـاری ڕاستگۆیـانەو ، تەواوەی خۆی ببینێت‌و ، شیعرەکەی لە بەرانبەر ئەم کارەیدا هیچ نەبووە « ئەگەرچی ڕۆمانەکەی پڕی لە چامەبـوو ، کە ، وەك لەو بـاوەڕەدایە ، باشترین شتە نووسیویەتی » .

پاش تۆزێك سەبارەت بە وێژەی فەرەنسەوی دووایین ، وەك چۆن ئەوسا زۆر جار وامان‌دەکرد . باسترناك ڕۆمانی « ڕشانەوە »ی سارتەری خوێندبووەوەو بۆی دەرکەوتبوو کە بێزهێنەرەو بە جۆرێکە ناخوێنرێتەوە . دەیپرسی ئایا دەبێت ئەم گەلە مەزنە نەتوانێت پاش چوار سەدە داهێنانی

بلیمەتانە ئەدەب بنووسێت ؟ ووتیشی ئەراگۆن خزمەتی سەردەمی خۆی دەکات و، دۆمال و گینو بە شێـوەیەکی وا ڕێ ی تێنـەچێت مرۆڤ بێـزار دەکەن .

ئەنجا پرسیاری کرد : ئەرێ مالرۆ هێشتاکە هەردەنووسێت ؟ بەر لەوەی بتوانم وەلام بدەمەوە یەکێك لە ئافرەتە میوانەکان پرسی : ئەلدۆس هکسلی پاش « دوو خالی دژ بەیەك » چی ی نووسیوەو ئایا فرجینیا وولف هێشتا هەردەنووسێت .

زۆر گرانە باسی ئەو کامەرانی یە بکرێت گواستنەوەی هەوالی هونەرو ئەدەبی دەرەوە بۆ ئەو کەسانەی تینووی بیستنیانن دەیهێنێتە کایەوە .. هەرچیم لە تواناد ا بوو لە هەوالی وێژەی ئنگلیزی و فەرەنسەوی و ئەمریکی پێم ڕاگەیاندن . وەك بلێیت بۆ قوربانی یانی کەشتی یەکی تێکشکێنراو لە دوورگەیەکی نەناسراوی دابراو لە شارستانیـەت دەدوێیت . یەکێـك لە ئافرەتە میوانەکان پرسی ی ئایـا هێشتاکـە شکسپیرو ئـەبسن و شۆ .. لە شانۆی ڕۆژئاوادا ناوی گەورەیی یان ماوە . ئاگادارم کرد کە بایەخدان بە شۆ خەریکە کز دەبێت و زۆرجار چیخەف پێشکەش دەکرێت و بایەخ پێدانی پەرەدەستێنێت . هەروەها ووتم ئەخماتۆڤا پێ ی ووتبووم لەم بایەخدانە بە چیخەف تێناگات ، چونکە جیهانەکەی بەردەوام جیهانێکی دل پەستەو ، هەرکیز خۆری تێدا ناکەوێت و ، شمشێری تێدا بریسکە ناداتەوە . هەموو شتێك لەجیهانی ئەودا بەتەمومژێکی ترسناکی خۆلەمێشین داپۆشراوە . ووتی ئەوەیش تێکدانی ژیانە . ( جارێکیان بیستم کە ییتس هەمان شتی سەبارەت بە چیخەف دەگوت : چیخەف هیچ شتێك دەربارەی ژیان و مردن نازانێت و ، نازانێت بـەهەشت پـڕ لە دەنگی شمشێر وەشـاندنـە .. ) . باسترناك ووتی ئەخماتۆڤا بە تـەواوەتی بە هـەلەدا چووە . لەسـەریشی ڕۆیشت : بە ئەخماتۆڤا بلێ ، پێ ی بلێ بە زمانی هەموو ئەوانەی لێرەن ،

هەموو نووسەرەکانی ڕووس ئامۆژگاری بۆ خوێنەر پێشکەش دەکەن ، بکرە تۆرگینێف دەیگوت کات دەرمانکردنی برین دەگرێتە ئەستۆی خۆی ، ئەم جۆرە قسەیەیش . تەنیا چیخەف ئەوەی نەکردووە . ئەو هونەرمەندێکی پاکە ـ هەموو شتێکی لەلا بە شێوەیەکی هونەری‌یانە چارەسەر دەکات ـ چیخەف وەلامی ئێمەیە بۆ فلۆبێر . هەروەها لەسەری ڕۆیشت لەوانەیە ئەخماتۆڤا سەبارەت بە دۆستۆیەفسکی بۆم بدوێت ، لەوانەیشە هێرش بباتە سەر تەلەستۆی . بەلام تەلەستۆی لەسەر هەق بوو کاتێك سەبارەت بە ڕۆمانەکانی دۆستۆیەفسکی ووتبووی کە ئاژاوەیەکی تۆقێنەری ، تێکەلاوی‌یەکی شۆڤینی‌یانەو ئایین پەرستی‌ی هستیری‌یانەیە ، ئەمە بە ئانا ئەندرییڤنا بلێ ، ئەوەی سەبارەت بە من پێ‌ی‌بلێ بەلام کە دووبارە ئەخماتۆڤام دی ، ئەویش لە سالی ١٩٦٥ دا ، لە ئۆکسفۆرد بڕیارم دا باشتر وایە ووتەکانی ( باسترناك ) ی پێ‌ڕانەگەیەنم ، لەوانەیە ئارەزووی وەلامدانەوەی هەبێت . بەلام باسترناك لەناو گلکۆکەیدا بوو . لە ڕاستیدا ئەخماتۆڤا بەوپەڕی سەرنج ڕاکێشانەوە سەبارەت بە دۆستۆیەفسکی بۆم دووا .

سەرنج :

ئەم گفت‌و گۆیانە لە پاشکۆی وێژەیی ( تایمز )دا ڕۆژی ٢١/ ١٠/ ١٩٨٠ لەژێر ناونیشانی « چەند گفت‌و گۆیەك تەك شاعیرانی ردسن‌دا » بلاوکراوەتەوە .

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە گۆڤاری ( ئەقلام )ی ژمارە ( ٧ )ی سالی ( ١٩٨١ )ە .

# پێشگوتن

ل رۆژا ٥ ـ ٦/٢/١٩٨٦ ل هۆلا چالاکێید فێرگەهان ـل پارێزگەها دهوک ئاهەنگەهك بەرفرە هاتە سازکرن. ئێکەتێید تورڤان و نفیسەرێد کورد تاێین هەولێر و سلێمانی و هەژمارەك ژ بەغدا و باژێرێد دن ژی هاتبون ... د ڤێ ئاهەنگێ دا تبابەك لێکۆلین و گۆتارێد ئەدەبی دبوارا جگەرخوین و ئەدەبێ وی ، ژینا وی و وەلات پەروەرییا وی ، هەروەسا دەورێ وی و بەرهەمێد وی د مەیدانا زمان و دیرۆك و رەوشەنبیرییا کوردیدا ، هاتن پێشکێش کرن هەژی گـۆتنێیە جەمهۆرەك مەزن ئامادە ببون . هـۆلا مەزن تـژی ببو و زاف کـەس ل سەر پێـد خوە ژی راوەستابون و بکەیف خوەشی گوهداری دکرن ...

ل ڤێرێ ئەم ژ دل سپاسەك گەرم پێشکێشی ئێکەتیا تۆرڤان و نفیسەرێد کورددکین بو وی دەورێ پێ رابویی ، کو براستی جهێ سەربلندییا هەمی تۆرڤان و ئەدەب دۆست و جەمهۆرێ کوردە ، ل هەر دەر ... ڤایە ئەم وان لێکۆلین و گۆتاران ل سەر روپەلێد «نووسەریکورد» ب شانازی بەلاڤ دکین و هیڤیدارین کو مە ب ڤی کارێ خوە شیابت ئەم دلۆپەکێ ژ دەریا قەنجییا جگەرخوین ژ سەر خوە راکین .

عبد الکریم دوسکی

---

١) ئەڤ هێژایە پشکداربون تێدا . عبد الکریم فندي دوسکی، تیلی أمین ، صبري بوتانی ، حچي جعفر ، مصطفی نەریمانو سکڤان عبد الحکیم ،

# جەگەرخوین و
# زمانێ شعرێ د دیوانا یەکێ دا

* تیلی امین *

رەنگە بهەلە بچین دەمێ دهێین هندە لایەنێت ئەدەبێ کوردی شروڤەدکەین و لدوی هندە گرفتاری د مەسەلا ڤەدکولین و تێدا رای و رێبازێ لێکولینەوەرو زاناو رەخنەگرێت خەلکێ بیانی لسەر ئەدەبێ مللەتێ خو زارڤەکەین . چونکە ئەدەبێ کوردی و بشێوەکێ گشتی، ئەدەبێ هەر مللەتەکێ دگەل یێ دی جیاوازەو ، هەر یەکێ سەنگ و بیڤانێت خو هەنە.

لێ ئەڤ چەندە ، هندێ ناگەهینت ، ئەم خو ژڤەکولین و رەخنەسازی یا ، زانایێت جهانی دابربکەین و سود ژرای و ئەنجامێت باس و لدوی چونێت وان نەوەرگرین.

مەبەستا مە بڤێ چەندێ هەمیێ ، بابەتێ مەیێ نهویە ، کە زمانێ شعری یە ، ددیوانا جەگەرخوین یایەکەمدا . دەمێ زمانێ شعری لدەڤ جەگەرخوین باسدکەین ، ئەڤی زمانی ناوەرگرین ، کا هەتا چ رادە پەیڤ و زاراوێت شعرێ ، واتەو مانەو رامانێت خو ڤەگوهاستینە ، ئەم بشێوەکی ناوەرگرین ، کە ئایا شاعر کاری یە ، بئەڤان پەیڤا یێت وێنە بێ گرتین، سوزو هەستێ خویندەواری بێ بهەژینت ؟. ئەم ناوەرگرین ، کە تا چ رادە ئەڤان زاراو وپەیڤا هێزەکا (تەعبیری) هەیە.

دڤان هەمی دیوان و نڤشتان‌دە جگەرخوین ژبو مللەت و وەلاتێ خوە ستراند ، ژبو ژین و ئەڤینێ ستراند ، ژبو مرۆڤاتی‌یا دنیایێ ستراند ، دژێ هێزێن رەش و ستەمکار و ئیمپریالیستا جیهان دوش و مرۆڤ کوژ ستراند ..

وی قەت سستی نەکر ، هەتا مرنێ ل‌سەر سوزا خوە ما .

**هەتا دل رانەوەستی**
**ئەز نابێژم ب‌سستی**
**کێر گهایە سەر هەستی**
**ئەز نزانم چ بێژم**

ئەگەر سەرکەتنا کەسێ هونەرمەند و شاعر ئەو بت کو بەرهەمێن هش و بیرێن وی دسەر و دلێ وەلاتیێن وی‌دە جی‌بگرن ، بێگومان جگەرخوین گەلەك بەختیارە ، و ڤایە ئەمێ دبینن کو میناکێ وی ل‌سەر پەرێ دلە .
هەرچەند مە تبابەك بەرکەتی ژ ئاخاڤتن و تەڤگەرێن سەیدا جگەرخوین نڤیسینە و هەمی ژی بەردەستن ، لێ نهو ، د ڤێ بیرانینێ‌دە ، یا دجی‌یێ خوەدە وئەز بشێم بێژم ، ئەوە کو هندەك ژ بیرهاتنێن خوە ئێن وی چاخێ کو بەهشتی ل موسل و بەغدا و پاشێ ژی ل کوردستانێ دما ، پێشکێش بکم . وچەند گوتنەك کورت ژی ژ دەڤێ وی ئێ زێرین . و نەچارم ژی دو ـ سێ موڤکێن کورت و کەس نەبهیستی ، ژ سەرهاتیا وی ل عراقێ دڤێ بیرانینێ‌دە پەردێ ژ سەر راکم و جارنا ژ بابەتێ خـوە ژی دەرکەڤم ، لێـنـەژکەڤلۆکێ‌خـوە ... دیارکـرنا رۆلا جگـەرخوین د هشیارکرنا مللەتێ کورددە و پەسنێ وەلات پەروەریا وی نەهەوجەیێ گۆتنێنە .. ژخوە لێکۆلین و توژاندنا بەرهەمێن وی ، ژ هەر کناری‌ڤە ، ژمن زێدەیە و قەت نەفهێتە ژی ئەگەر بێژم : ئەز نە سوارێ ڤێ مەیدانێ مە . نەمازە شعرێن وی تژی دنێڤدە ئیشارەت و نیشان و ناڤێن ئەفسانەیی ، دیرۆکی ، جهێن دێرین و داستانن ، و هەر یەکێ چیرۆکا خوە هەیە .. من نەباوەرە کەسەك دن وەك وی شیابت هند ناڤ و نیشان و ناڤەرۆکێن کەلەپۆری ب‌ئاوایەك هونەری دشعرێ‌دە بکار ئانی بن و ئەو هەمی میناك و کەڤالێن نوو ژێ چێکربن ، ئان ئافراندبن ، ئەو میناك و کەڤالێن کو دێ وەك چراێن گەش دنێڤ تۆر و رەوشەنبیری‌یا کوردی‌دە بمینن و قەت ڤەنامرن ... وی نەکێمتر ژ شێست سالان گۆت و نڤیسی .. گەلەك نڤیسی و کێم چاپ کر ، و ئوشتا چاپ نەکرنێ

ژی ئەم هەمی دزانن چ یە .. مخابن ئەو کێما چاپکری ژی لەمە ببو خوونا سیاهۆش ، نەمازە ل کوردستانا عراقێ ، ژ هەزار کەسان ئێکی دشیا بەرهەمەکی ژ ئێن وی پەیدا بکت ، وی ژی دەست لێ دمچاند ، لێ پاشێ بسایا ڤەقیێن مزگەفتان بەرە بەرە بنڤیسینا دەستی و ئاوازکرنێ بەلاڤ دبون ، لڤر گەرەکە بێژم کو دەورێ مەلان ڤەقییان ژ ئێ هیکـار «معلم» و شاگـردێن هیکەهان مەزنتربو ..

هنگێ وانێن «هاوار ، ستێر ، روناهی و رۆژا نوو ددیتن و دخوندن تشتەك ژ جگـەرخوین دزانین . ژ وان عزەت عەبدلعەزیز ، سالح یوسفی ، شەوکەت ئاکرەیی و ژی درێژ محمد امین ئوسمان ـ تەك تەك ژ دیوانا وی ئا یەکەم و پاشێ ژی ئا دویەم و چیرۆکا رەشوییێ داری ، ل موسل و زاخو و شنگار و رەواندز و سلێمانی و کەرکوك و هەولێر ژی لجەم روناکبیرێن کوردێن وی چاخی پەیدا دبون . لێ وەسا ژی پێترێ مللەتێ کورد ل کوردستانا عراقێ ـ ئەگەرچی ناڤێ وی بهیستبون و دبهیستن لێ تشتەك ژ چالاکی و تەڤکەرا وی ئا رەوشــەنبیری و رامیــاری نەدزانین ـ لێ کو ل سوریا دگرتن و دئێشاندن ، باس و ناڤێ وی د بەلاڤوکێن پارت و سازییێن نهێنی یێن وی چاخێ عراقێ دە دهاتن . و بەیاتی و هەردو شاعرێن ناڤدارێن کورد گۆران و بێکەس ئاگەهی ژێ هەبون ، ژخوە «ئەسیری» ژ تەڤان بێتر حەژ جگەرخوین دکر ، وجگەرخوین ژی ب چاڤەکی بلند بەرێ خوە ددایێ ، ئەو شعرێن هنگێ دکۆڤارا «هاوارێ» و «زارێ کرمانجی» دە ژبو هەڤ ئاراستە کرین خوەش بەلگەنە بۆ وێ پێوەندییا وان .

ل سالێن چلان تبابەك ژ دیوانا وی ئا یەکەم لدەڤەرا شنگـارێ هاتـە گرتن و ل مـوسل شەوتاندن .. پاشێ دگەل سەرکەتنا شورشا چاردەهێ تیرمەهێ هەلبەستێن وی ژ پێلوەشـا کوردی ل بەغدا هاتن خوندن ، هەمی ژی نوو هونادی بون ، وەك : «پەیمانا بەغدا و زنجیر ژ گەردەنم شکەست» تاد ... دڤێ ئاڤێرا ژێ داخوازکرن بچت مسرێ و بەرنامەیەك رامیاری بزمانێ کوردی ژ رادیووا قاهیرە پێشکێش بکت ـ ئەلبەت ژبەرکو ل سوریە هەبونا مللەتێ کورد ماندلا دکن ، نەدبو ، ژ رادییوا شامێ پێشکێش بکت ، لەورا بەرێ وی ددان مسرێ ژبەر وەجا رژیما خوە ـ هەرچەند وی نەکر ژی ، لێ چما نەدگۆتنێ ژ رادیووا شامێ پێشکێش بکە !! . پاشێ ژنشکێڤە و ب مالڤە ل موسل‌رە دەرکەت ، ئەفسەرەکی لەشکری دگەل دگەریا چەند رۆژەکا مێڤانێ دەولەتێ بو ، و ل ئوتێلا کیرویێ ئەرمەنی دنڤست .. ژ وان کەسێن دهاتن جەم و هاتنا

وی گرنگ ددیتن و سەخبیری و ئالیکاری‌یا وی دکرن ، شەهیدێ وەلاتێ خوە سەیدا ئەنوەرێ مائی ، مەلا شەمسەدین و ئەحمەدێ سەعدێ بون و هندەك ژ کوردێن مشەختی ژی دهاتن ،

باس باسێ زمانێ کوردی و فەرهەنگ و دیرۆکا کوردی بو .. پاشێ زۆل پشکا کوردی یا کولیژا ئاداب ـ زانکۆیا بەغدا ـ هاتە تەرخان کرن سەیدایێ دەرسا کورمانجی ول رادیووا کوردی ژی

دو بەرنامە ، ئێك دیرۆکی و ئێك ئەدەبی بەرهەڤ و پێشکێش دکر .. لێ جگەرخوین و تەناهی نە بسەر هەڤەنە ، بەلایێ سەرێ خوە لێ هلدا . ژێ داخوازکرن کو ل عیراقێ نەمینت ـ بەری

هنگێ ژی وان کەسێن کو خوە ژ کوردان دهەژمارتن بزاڤا راتەقاندنا وی کری بون ، لێ ڤێ بزاڤا وان بەرنەگرتبو ـ خوە بەرهەڤ دکر دا رێیەکێ ژ خوەرە ببینت ، فەرمانا گرتنا وی دەرچۆ ، ئها لڤر ، بناڤێ جگەرخوین و ژ دەڤێ وی بو تاریخێ دێ دبێژم و ئەز بخوەژی ئاگەهدارم کو :

رەحمەتی شێخ خالدێ نەقشبەندی ـ بامەرنی ـ ژ هەمی دلێ خوە بگەرمی پشتا وی گرت و خوە د بەردە وەستاند و ژ گرتنی پاراست ، کرکو بکەیفا خوە بێ ریپ و بەلا ژ عراقێ دەرکەڤێ .. ئەڤ ئالیکاری‌یا کو شێخ خالد نەقشبەندی بو جگەرخوین کری ل وان نەحەزێن وی گران هات . دگۆتن : خالد لکۆ و جگەرخوین لکۆ ؟.. ئەڤ گۆتنا وان بەرگوهێ خالد کەت و گۆت :

«ئەو کەسێن ڤێ دبێژن دخەلەتن و بێ خیرەتن ژی ، راستە ئەز و جگەرخوین بهزر و بیر و باوەرێن خو ژێك دوورین و ئەز نەدگەل ریبازا وی یا فەلسەفی مە ، لێ جگەرخوین شاعرەك مەزنە و دەنگێ کوردایە ، د تەنگافیەکا وەك ڤێ یا ئەو نهو تێدا ئەز نەشێم پاتکا خو بدەمێ ، خاسما ئەو کەسێن هاریکاری‌یا وی بکن ، هندەك نەدیارن و هندەك ژی دخوڕا نابینن».

جگەرخوین ژ عراقێ چۆ . کا چاوا هاتبو وەسا ژی چۆ ، دەستەك لپێش و یەك لپاش .. چۆ ، لێ چۆ کۆ ؟ .. ماکەنگی جی‌یەك بو ئێن وەك وی هەیە لێ بئێورن ئان تێدە هێسا ببن ؟! .. چۆ سوریە ، وەك ئێ «ژبەر دلۆپان چویی بەر شرکێ» گرتن و سەرگوم کرن ـ شاندن بازارێ «سوێدایێ» چیایێ دروز ، خەلکێ وێ گەلەك سەخبیری لێ دکرن ، هەتا بنەمالا سولتان پاشا «الأطرش» ژی پیتە ددانێ و وەك رەوشەنبیرەك مەزن و شورشڤان لێ دنەرین .

## جگەرخوین و رەوشەنبیری‌یا کوردی

جگەرخوین ئالا رەوشەنبیری‌یا کوردی هلگرت و ب‌وی زمانێ خوە ئی شرین دەولەمەندکر، تایبەتی و رەسەناتی‌یا ئاوا رێبازا وێ ژی پاراست – ژ ئێریش و کارتێکرنا ئاوا و کێش و پیڤانێن بیانی پاراست – مە ئەڤ گۆت چکۆ دیتانییەک[1] هەیە جارنا سەر هلددت و دبێژت: «تـەنێ مللەتێ هێژا !! تۆرێ خوە ئی تایبەتی هەیە !!» یانی دڤێن بێژن: هندەک مللەت هەنە بێ تۆرن – تۆرێ خوە ئی تایبەتی نینن !، تۆرێ وان ژ تۆرێ مللەتەکی دنە !.. تـاد .. بێگومـان ئەڤ دیتانی‌یا وان بێ بنیاتە، لێ هەتا ئەگەر راست ژی بت، گەلەک ژ مللەتێ مە دوورە و ئێ هێژاتر و خودانێ تایبەتی‌تر مللەتێ مەیە. کەلەپۆر و زارگۆتنا مە – ستران، لاوک، دیلۆک، پیرەپایزۆک و پەندێن پێشیێن مە .. تاد .. ژێدەرێن بنیاتینە بو تۆر و رەوشەنبیری یا مە، ئەڤ ژێدەرێن مە،

هەزار دیتانی و گۆتنێن وەک ڤێ پوچ دکن .. لێ چاوا ؟! هەلبەت ئەو ژی ب‌خوندنا بەرهەمێن وان نڤیسەر و رستەڤانێن کو پیتێ ب‌کەلەپۆر و زارگۆتنا مللەتێ خوە دکن، چێتر دیار دبت، هەلبەت گەلەک چقل ژ کەلەپۆر دچن و گۆتنا مە لسەر. تۆری‌یە – نەمازە ئێن جگەرخوین گەلەک تێر نمونەنە، دەکا «دەنگێ پەریشانێ، لۆلۆ پسماموٚ، لاڤ لاڤ چنە، پیری و جوانی .. تاد .. چ پێوەندی ب‌ناڤەرۆک و ئاوایێ مللەتەک دنڤە هەنە ؟، کو هەمی ژ کارتێکرنا زارگۆتنا مە هاتنە ئافراندنێ و بابەتنە نوو ژێ چێ بونە .. تایبەتیا مە ئەڤە و بێنا وەلاتێ مە ژێ تێت، شەقل و هێلا پێشیێن مە پێڤەنە، بنیاتێ رەوشەنبیری‌یا مە ژ کەلەپۆرێ مەیە. هەتا سەیدایێ خانی ب‌خوە ژی ب‌سایا داستانەکا کوردی، ئالا رەوشەنبیری‌یا کوردی بلندکر. و هوسا خوە لمە کرشەکر.

جگەرخوین د ڤێ مەیدانێ‌دە رولەک مەزن لەیزت، گەلەک کەڤال و میناکێن نوو ژ کەلەپۆرێ کوردی و ژ ئێ مرۆڤاتیێ ژی ئافراند و رەوشەنبیری‌یا مە پێ وەرارکر. دیوان و نڤشتێن وی، چاپکری و چاپ نەکری، ژ ناڤەرۆک و ئاواز و ئاوایێن تایبەتی – خومالی داگرتینە ئەڤین، رومەت،

سنج و فەلسەفا ژینا مە ئا جڤاکی ژێ دبارن، هەمی ژی هەریەکێ ب‌شێوازەک سپەهی و بێ گرێ دقالبەک کوردی و پیڤایی‌دە ل رستێن خوە گڤراندنە، کو قەت باوەرناکم شاعرەک دن هەبت شیابت وەک وی و تەمی‌تی وی، زارگۆتنا مللەتێ خوە ژبو ئامانجنە نوو، برەمز پەسنێن دەلال و

بهێز ئەرك دابتێ و ب سەلیقا کوردی پاراست بت ، بێ کو تەمەتی سەرێ دەرزیێ ژ رەسەناتی و زەلالیا وێ شێلۆ بکت .. ئەڤە دێ نمونەکێ ئەڤینداری پێشکێش بکم ، ئەگەرچی ، نەمازە فەقی و مەلا ب ئاوایەکی دل شەوات ئاواز دکن و دخوینن ، لێ هەم «سەرێلی» یە ژی ، هەلبەت ئێن وەك ڤێ و ژ ڤێ چێتر و نازکتر ژی د دیوانێن وی‌دە مشەنە ، لێ تەنێ وەك نمونە ئەو ڤێ پێشکێش دکن چکو پێوەندی ب ڤێ گۆتنا مەڤە هەیە .. بخوینن ، ببینن کا چاوا و ب چ رەنگ و ئاوایی سەیدا چیایێ سیپانێ خەلاتێ ب داستانا «خەج و سیامەند» ڤە ب کورتی د کەڤالەکی سپەهی‌دە بەرچاف کریە و چاوا دلێ کەسێ ب ئامانجا خوە شاد نەبویی خەمگین کریە .

## پیری و جوانی

ژ رەمزا ئەبرۆێن تەی قەوس و هەیڤی
نەمایە من ژ عەمرێ خوە تو هیڤی

لەسەر پالێن ئەجەل هەی هەی دبازن
ژ سەرژۆر دابەرستن سەر نشیڤی

بمن پیری گهشت و چۆ جوانی
شکەست و چۆ ژ بەر بۆغێ بریڤی

بمن تەنها هەبو جانەك و جوانەك
مەنیڤی‌دا ئەڤینێ مایە نیڤی

ئەوێ دی تەڤ مە دایە بەر پیێن تە
دعەمرێ خوەدە نەدیبو من کریڤی

مە ئاهوچاڤ بەلەك دی و مەدا پەی
لەبەر من بو بەرانێ قەرتە کوڤی

مەنێچیرا خوە گرتی وەك سیامەند
دپشتا منڕدە خیپەك زڕ بەهیڤی

ل سیپانێ خەلاتێ ئەز دنالم
تو مایە وەك خەجا دۆتا سلیڤی

جگەرخوینۆ گەلەك شێرێن وەکی تە
د ڤێ ڕێدە قەلستن بوونە ریڤی

## جگەرخوین وەك خوەیە

پرانی‌یا شاعر و نڤیسڤان و هونەرمەندێن ڤێ جیهانێ ، ئەگەر کەڤن و ئەگەر نوو ، تـو بەرهەمێن وان ب‌خوینی و ئاوا و شێواز و ڕێچا کیژوان بۆخوە گرتی و لەسەر چوویی‌بزانی ، دێ ببینی کو ئێکی دن ژ وی کەڤنتر ئان هەڤچاخێ وی کارتێکریە . هەلبەت ئەڤ دهەڤبەرکرنێ دە چێتر خویا دبت . بۆنمونە ئەز دبێژم : گەلەك ژ شاعر و نڤیسڤانێن ب‌ناڤ و دەنگ ژ وان مللەتێن دزندانا ئەمبراتوری‌یا ئوسمانی‌دە بوون ، بگرە ژ دەسپێکا ڤی چەرخێ ئەم تێدە تا ڤان سالێن دوماهی‌یێ ژی ، کارتێکرنا نڤیسەر و تۆرڤـان و رۆژنامـەڤانێ تـورکێ ناڤـدار نامق کـەمال ب‌بەرهەمێن وانڤە دیارە ، چ شعر و چ پەخشان . ژخوە ئەگەر بەرهەمێن هندەك ژ وان بینی هەڤبەری ئێن نامق کەمال بکی دێ ببینی کو ژ تورکی وەرگەراندینە . لێپا ژێدەرێن جگەرخوین ئاخ و ئاف و بایێ وەلاتێ وی‌نن . ژ زەڤیکا هەڤند و رەزکێ تەمۆ و پەرگالا سۆڤی سمۆ دەست پێ کریە .. پیرا تۆرێ و ڤاتا سەر ب‌رشك کارتێکرنە ، پاشێ هێنوو جیهان دایە بەرخوە ، رامیاری جڤاکی ـ ئابۆری ـ ئەڤینداری ـ دیرۆکی و پیشەسازی .. ئەگەر قـەیمەگـر و بابـەت پیڤێن دووربین و راست‌بێژ هەبن دێ بێژن : دەم و قوناغ ژ جگەرخوین رە نینن .. چکۆ تبابەك ژ بابەتێن دیوانا یەکەم هەروەکی ل زەمانێ خانی هاتبن نڤیساندنێ و ڤانە ژ سالا ١٩٤٥ ڤە تێنە خوندن و ڤێ گاڤێ ژی ژ هەر ئالیڤە خۆدیکا شین و شادی‌یا ژینا مەنە ، ئەو ژ دیوانا شەشێ چێترە و

بەرڤاژی ژی راستە و هەمی ژی هەر وەسا ، وقەت لکێمێ نەدایە ودێ جیلێ پشتی مە ژی ڤێ بێژن و هنگێ ژی دێ وەك نهۆ بابەتێن گەرم و تازە دنێڤدە ببینن و بکن ژێدەرێن مێژوویی ژی ..

کەسێ دیوانا . وی ئا یەکەم باش خوەندی بت ، ئەو باشی هینی زمانێ خوە بویە و ملەتێ خوە ژی ناسکریە و دیرۆك و جوگرافیا وی ژی زانی یە .

## جگەرخوین و کارێ رامیاری

گەلەجا ئەندامێن پارت و سازیێن سیاسی و گەلەکەسێن سەربخوە ژی ، ژێ دخوەستن کو مایێ خوە د کارێ سیاسی‌دە نەکێ .. دگۆتنێ «سیاسی‌یە ، لێ خەباتا سیاسی مەکە ، تو شاعرێ ملەت و وەلاتی ، خوە مەکە ئالشێ رەخەکی تەنێ . نەمازە تو پیر بوویە و ئێش و ژانێن پیریتی‌یێ سەری ژتە ستاندنە». لێ سەیدا ب هشکی بەرسڤ ددا و دگۆ ئەز نەشم ژ خەباتێ دوور کەڤم ، ئەز پەرگالا ملەتێ خوە دبینم ، گەرەکە ب وی‌رە و ژبۆ وی - بخەبتم ، تم ل کاربم ، شاعرم و گەرەکە شاعر وەك گۆتنا خوەبی ، گۆتنا وی و کرنا وی یەك‌بی . شاعرێ نە وەسابی بلا دەڤێ خوە بگری و ئێدی قەت ڤەنەکی .. دوورکەتنا من ژ تەڤگەرا شـورشگەری و رامیـاری بێ رۆمەتی‌یە . بێ‌رۆمەتی ژی مرنا مرۆڤێ ساخە .

## شاعرێ چێتر کی‌یە و چاوایە ؟

ژێ پرسین ، تە دڤێت شاعر چاوابی ؟. گۆت «ون چما ڤێ پرسا ئەرزان ژمن دکن ؟ شاعر ئەوە ئێ کو دگەل خوە و ملەتێ خوە و مرۆڤاتی‌یێ راست‌بی .. شاعرێ چێتر ئەوە ئێ ل ژێر دەردێن گران و دژوار سەرهلدی .. شاعرێ چێتر ئەوە ئێ کو خەبـات و کێفەرات و نـالینا رەنجبەرێن زەحمەت کێش ، ب خوونا دلێ خوە و ب شێوازەکی هونەری دکی شعر و بەلاڤ دکی .. شاعرێ چێتر ئەوە ئێ کـو ب دەستێ ملەت ، وان پەردەیـێن کو ب خـاپ و پیلان هـاتنە خەملاندن و ب پەیڤ و گۆتنێن قەلەو تێنە پیرۆزکرن ، دچرینی و ستەمکاران رسوا دکی کورت کورمانجی گەرەکە شاعر تێکۆشەر و مرۆڤ‌بی هەڤالێ ملەتێ خوەبی .

## جگەرخوین و فەرهەنگا مەزن و تەڤایی

جگەرخوین ژ مێژڤە های ژ ڤێ فەرهەنگا مە یا بەرنیاز هەبو .. ئەو فەرهەنگا کو ل سالا ١٩١٨ کۆمەلا کورد ل ستانبول دکۆڤارا «ژین» دە ناڤێ وێ ئینایی و گۆتی «کۆمەلە دێ فەرهەنگەکا کوردی سەراست بکە و بوەشینە ، هەمی زارێن کوردی دێ د وێدا جی بگرن».[1]

هەروەها نڤیسڤانەکی کورد بناڤێ «کوردێ بدلیسی» د هەژمارەکا وێ کۆڤارێدە گۆتارەك دبوارا فەرهەنگەکا گشتی بەلاڤ کریە .. جگەرخوین هەر دگۆت ئەگەر سێ کەس ، هەریەك لدەڤەرا خوە ، ئالیکاری هەڤ بن ، پەیڤ و ناڤێن کەڤنار و جهێن دێرین ژ دەڤێ خەلکێ و ژ سترانێن کەڤن وگۆتنێن پێشیان وەك ئاوایێ لێڤکرنا وان د رستاندە ژهەڤرە بشینن ولگۆر تیپا سەرێ پەیڤێ هەریەکێ دجهێ وێدە ددەفتەرەکێ دە جەم خوە بنڤیسن ، دێ ددەمەکە کورتدە بڤی ئاوایی فەرهەنگەکێ لمە زیدەبکن و ل پاشەرۆژێ ببت ئالیکارییەك ژبۆ فەرهەنگا مە یا مەزن و تەڤایی».

پاشێ ل سالا ١٩٥٩ لموسل ئەڤ گۆتنا خوە ژبو مێڤانێن خوە دوبارە دکر .. پشتی هنگێ ژی ل سالا ١٩٦٢ د پێشگۆتنا «فەرهەنگا کوردی» هەژمار (٢) دە گۆتیە (.... ئەڤ تشتێ کو مە دڤان هەردو هەژمارێ فەرهەنگا خوەدە نڤیسیە نەتەنێ کوردی ئەڤە ـ نەتەنێ کورمانجی ئەڤە ، بەلکی نەتەنێ تشتێ کو دزانم ئەڤە . بەلکی گەلەك تشت هەنە کو نەهاتنە بیرا من ، چاوا کو گەلەك شێوە ژی هەنە نزانم ، بەلکی ئالیکارییەکە ژبۆ فەرهەنگا مەزن ـ فەرهەنگا کوردییا تەڤایی .....).

## جگەرخوین و رەخنە

ئەگەرچی مە هەتا نهو تو رەخنە و لێکۆلینێین ئەدەبی ژ نڤیسینا وی نەخوندینە ، لێ دنامەیەکیکێ یا خوەدە داخوازا کتێبا «طبیعة المجتمع الكردي في أدبه» ، یا بەدرخان سندی ژ من کربو . پاشێ ژ بەرسڤا وی من زانی کو ئەو هەڤالێ ئاڤاکرنێیە ، یانی پشتیڤانێ نژلاندنێیە ، نە ئێ هەرفاندنێ ، دمەیدانا رەخنێ و لێکۆلینێدە ... گۆتبو : «درۆژنامەیا ـ التآخي ـ دە ،

ماموّستا عەبدولا حەداد ناڤەکی دبوارا کتێبا «طبيعة المجتمع الكردی في أدبه» نفیسیە ، جا ژبەرکو بابەتێ کتێبا ناڤبری لجەم مە دەرگەهەك گرنگە ، حەز دکم بخوینم ، ئەگەر تە هەیە بوّ من بشینە ، و ئەگەر تە نینە ژی پەیداکە و ئەز سوّزا ڤەگەراندنێ ژی ددم).

مە داخوازا وی بجی کر و پاشێ پشتی بێتر ژ مەهەکێ دگەل نامەیەکێ لمن ڤەگەراند ، گوّتبو : (ب تەخمینا من ئەڤ کتێبا بەدرخان سندی تشتەك باشە و ماموّستا عەبدولا چ فایدە نەگهاندیێ . کێما سییا بەرهەمێ هەڤ دیارکن ، لێ ب نەرمی و دوور ژ کەرب وکینێ . کێما سییا وێ ئەوە کو نە ب زمانێ مەیە . دلێ من چوّیێ بکم کوردی و هنەکی لسەر باخڤم و کێمەکێ ژ جەم خوە ژی بەردم سەر. لێ مخابن مە نەچاپە و نەدەلیڤە و نەژی دراڤ .. ژ بیر مەکن ژی کو گەلەك کتێب و بابەتێن پێوەندی ب مە و وەلاتێ مەڤە ب زمانێن بیانی هاتنە نفیساندن و چاپ کرن . جا چ کوردان ئەو نفیسیین و چ ژی نڤیسکارێن بیانی ، وەك نموونە ئەز دبێژم ، چ دەما ون بەرهەمێن ئەحمەد عارفێ دیاربەکری بکن کوردی ، ون دێ رەنگ و دەنگ و رەوش و رووچکێن خوە ئێن دیروّکی و جڤاکی تێرا ببینن .

## ددیت ، دپرسی و پاشی دنفیسی

د رێیا هاتن و ڤەگەرانا خوەدە ، گوند ب گوند و زوّم ب زوّم دپرسی و دنفیسی ، جهێن دێرین ، بویەرێن نوو ، ناڤێ گوند و یێ دەرامەت ، هەر تشت دنفیسی و دکر دیروّك «تاریخا کورد» و زمان ژی پێ وەرار دکر .. ئەو رێیا تێرا دچوّ ئێدی تێرا ڤەنەدگەریا ـ ئەگەر شیابا ـ داکو هن گوند و جهێن نەدیتی ببینت . جار پەیادە و ار ب وار ، جار ژی ل کەرێ سلو سوار .. روّژەکێ گەهشت و ئەڤ هەلبەستا نازك ژ بویەرێن دیروّکی و قارەمانێن ناڤدار ژبوّ رەوشا خوە یا وێ کاڤێ هوناند گووەست و زەحمەت و هیڤی ژێ دبارن .

بەسە دلبەر هەتا کەنگی ل شام و گەهـل دەربەند بم
دبەندا زولفێ مە ئیروّ هەتا کەنگی دنێڤ بەند بم

ئەڤینالتە کرم سەیدا و سەیدا تم ب نالینە
گەلۆ دلبەر دخوازی کو دڤێ رێ‌دە سیامەند بم ؟

دلێ من خوەش دکی نازك لمن برهێن خوە دشکێنی
دخوازی دەرکەڤم شاخان وەکو ئیحسان و فەرزەند بم

ژمن شیرین دخوازی کو وەکی فەرهادێ ئازا بم
بکولم کوهێ قەندیلی ژ خەسرو رە هنەرمەند بم

* * *

## مروڤاتی‌یا جگەرخوین

زەلامەکی بەرواری پرسیارا پیرەمێرەکی ژ مـالان کربـوو ، بێ کو بـزانێ ئەو پیـرەمێر جگەرخوینە . گوتبوو : پیرەمێرەك بێ سەر و بەر و قەلەوە». وان ژی جگەرخوین نەدناسین و گوتبوونێ : ئەو پیرەمێرێ تو ژێ دبێژی ئەم نزانن کی‌یە و چ کەسە ، لێ کو جارجار تێتە گوندی ، ئەو و کاك بوتانی بیستەکێ ڤێکرا دئاخڤن .. هەرە ژ وی بپرسە بەلکی ئەو تشتەکێ ژێ بزانێ ... هات و من ژی گوتێ : ئەز تشتەکێ ژێ نزانم ، لێ من بهستی‌یە دبێژنێ (خدروکێ دین) ، وی کو ئەڤ ژدەڤێ من بهیست هەتا ژێ هات تەپەك لرانێ خوەدا و سەرێ خوە گرت و گوت : «ئەز ژ خودێ خلاسبم من دزانی کو ئەو پیرەمێر ئان دینە ئان ژی خواجە خدرە». من گوتێ باشە ، لێ تە چاوا و ژ چ تە زانی ؟.. گوت : ئەز رێ‌ڤە دیتم ، دگەل خوهینام و چاکێتێ خو ژبەرخوکر و کرە بەرمن و بەتانی‌یەك هەبوو بڤێ خەنجەرا من کردو پارچە ، پارچەیەك ژێ دامن و سێ دینار ژی هەبوون ئەو ژی لمن و خوە نیڤی کر ، لەوا من هزرکر ئان دینە ئان ژی خواجە خدرە» لەوا ژی ئەز پرسیارا وی دکم .

پاشیٚ کومن ئەڤ ژ سەیدا پرسی ، حەزا شعریٚ هاتیٚ و گوٚت :

جگەرخوینم ژ ڤان دەردا
ل مەیدانیٚ خوە زوو بەردا
دناڤ باهوٚز و باگەردا
ب بیر و باوەر و دوٚزم
نە شەوقی و زەهاوی مە

## جگەرخوین وجڤات

ئەم نهو ل روٚژا ٢٥/ گولانا ١٩٦٩ آ نە .. سیها پیٚش هاتنا تاری بونا ئیٚڤارا دەرەنگ خوە ل قونتارا چیاییٚ رەنگین دایە ، زەراتیا روٚژیٚ هیٚژ کومبەد و نافسەرا وی بەرنەدابو ، نیٚزیکی ١٤ ـ ١٥ کەس ، هەڤناس و هەڤنەناس وەك کوٚمکا سیٚوییان ل سەر تاتەك پان و نزم ل هەڤ رونشتی بون و ب بیروباوەر و گوٚتنیٚن ڤالا بەرەنگاری هەڤ بوبون .. سەری ل هەڤ گیٚژ کربون

.. هشیٚ هەڤ رەش کربون .. سالوخیٚن چیروٚکەك دریٚژ و ئالوٚز ژ هەڤرە دگوٚتن ، ئاگریٚ بابەتیٚن ڤیٚ چیروٚکیٚ ، دەرد و خەمیٚن خومالی و کەساتی ژ بیرا وان بربون .. پشتی بەرهەڤدانەك دژوار و دل شکیٚن ئیٚکی گوٚت : «ڤایە جگەرخوون ژی هات ، یاراست ئەز وی ناناسم ، لیٚ ڤیٚ سپیٚدیٚ ل مالا جهادیٚ ئاکرەیی میٚڤان بو». برادەرەك دن گوٚت : «مە ژی ب چاڤ نەدییە ، لیٚ ئەوکی یە کو ناڤیٚ

وی نەبهیستی و ژ دوورڤە ناس نەکری ؟. ئەڤ هاتنا وی خوەش دەلیڤە بوٚ هەڤناسینیٚ و بەلکی ئەم بشیٚن ب شیرەتەك ئا وی ل هزرەکیٚ ژی بجڤن ، و بەلکی مە ژ خوەرە بکت هیٚڤیٚنیٚ شعرەکیٚ ژی». سەیدا هات و گوٚت :

ـ ئیٚڤارا وە خوەش لاونوٚ.

+ یاتە خوەشتر ، لسەر سەران هاتی سەیدا .

ـ ون چاوانن ؟ چ دکن و چ دبیٚژن ؟ .

+ ما دێ چ بێژین ؟. ئەم کول و کوڤانێن بووکا دیواناتە ژ هەڤرە ڤەدگوهێزن و دلێ هەڤ ژی دشکێنن.

ـ ڤە دلێ هەڤ مەشکێنن ، ئەگەر ون ب بیر و باوەر نەیەك بن ژی ، ژ بیر مەکن کو ژانا وە ئێکە .

دیوان و بووکا دیوانێ ژی دنێڤ سترانێن وەدە تێنە دیتن ، زمان و هونەر و دیرۆك و فەلسەفا ژینا وە ژی ، هەمی دنێڤ ستران و زارگوتنا وە دە نن ، ب هزرا من یەکبونا وە ژی ولو ... خوەزی هەڤالەکی ژ وە بستراندا ... بسترن ، سترانێن کۆزك و چەپەران بۆ من و خوە بێژن ، سترانا ئەڤینێ بێژن ، ڤیزان ب نێرگزان ب خەملینن و پێشکێشی خەیالا هەڤ بکن».

دەنگێ سترانا (عەمێ گوزێ) ل وی زناری دەنگ ڤەدا .. ئێکی گوت : برانو ، مە ژ خوەشیا هاتنا سەیدا های ژخوە نەمایە ، شەڤێ ژی بەر مە دە گرت و هنەك ژمە جهێ راکەتنا خوە ژی نزانن» .. ئێکی دن گوت : «ما کەنگی مە جهێ تەمارا خوە زانی‌یە ؟ دا ڤێجا ئیرۆ ئەو بزانن ؟ ،

هەر جهێ ئەم دگەهنێ خوەپانا مەیە و ئەم لێ رادکەڤن». جڤات بو دو بر ، برەکێ گوت : ئەم ژ جڤاتا سەیدا تێر نابن گەرەکە دەستورا چونا مە بدت». برا دن گوت : ئلقێ بلقێ هەتا سەیدا مە ب خوندنا شعرەکێ خەلات نەکت ئەم ژ سەر ڤێ تاتێ نالڤن ، هەما ئەمێ ل ڤێ چولا خودێ راکەڤن ، ها ئها ئەڤە ئەز مەخلیم ! ـ مەخەل هاتم :ـ ... زەراتیا رۆژێ خاتر ژ کولوسێ چیایێ ڤەزن دخوەست ، هنگێ د وێ گاڤێدە دەنگێ قەبقەبا کەوەکێ ژ وی پەسارێ ژوری هات ،

ڤەقەبو هەی قەقەبو ... قەبقەبا ڤی کەوی و داخوازا لاوان ئاشوپا سە یـدا هەژانـدن ، و راهێلایێ و گوت .. گوت ما هەما گوت ؟. هنگڤ ژ دەڤ دباری .

دەلالە نوو گهایە ، ل سەر من پر بهایە
ئەڤین هەردەم وەهایە ، جوانیێ چ کارە ؟

شێرین و گەور و نازن ، ژ دل ئەم هەڤ دخوازن
ل ناڤ دارا دبازن ، سی دایە سەر زنارا

دەنگێ ئاڤێ بلوّرە ، با ل پەلان دبوّرە
ئەم گوهـ ددن تلوّرە ، بلبل ڤیر و هەوارە

ئێڤارە چاخێ خەوێ ، کەو کهایە مێکەوێ
کەتمە بەرسینگا ئەوێ ، جهان خوەش و بهارە

ئوسا تا بـ ڤێ کێش و پیڤانێ هەونەکر ، دەڤێ زێرین نەکەت سەرهەڤ . وی بـ ڤان پەیڤێن نازك رەوشا دیمەنێ وی جهی مینا کەڤالەك دەلال و رەنگین بەرچاڤ کر . هوسا دیت و هوسا

گوّت ، وی ئەو گوّت یا کو دیتی ، ئەوجی ل بەروان خوەشتر و دەلالتر کر ، لەورا تەڤان ڤێکرا بێ هەمدی خوە چاڤێن خوە ل هاویر خوە راست و چەپ گەراندن ، گوّتن : پا بـ خودێ سەیدا باش

نیشا مە کر ، ئێکی ژ وان گوّتێ : «یاراست مە ژی دزانی و ددیت کو ئەڤ دەر پر خوەشە ، لێ پێش خوندنا شعرێ مە نەدزانی ئەمێ د ڤێ بەهشتێدە ، لێ نهو پشتی خوندنا وێ ئەم ژی وەك تە دبینن ..

هوسا جگەرخوین هەردو جوّن ژ خوە و ژ هەڤ ژی رازی کرن ، دەما د شعرێدە دیارکر کو راستە «ئێڤارە چاخێ خەوێ» یە هەم شعر ژی خوند لەسەر داخوازا وان هەڤالێن دگوّتن ئەم ژ ڤر نالڤن تا سەیدا مە بـ شعرەکێ خەلات نەکت ، هەروەها ژ وێ بەرهەڤدانا وان یا هشك ئانین

خارێ و نێزیکی هەڤ کرن ، نەمازە پشتی کو خوە کەناندی و گوّتی : لاونوّ ، هەڤالنوّ گەرەکە ون هەردەم دبەرهەڤدانێدە نەرم بن. ئیدی بەسە ، چێتر ئەوە هون بـ یەك دەنگ و دل بێژن :

بازم چیا کوّزا منە
سەربەستی تم دوّزا منە

## نهو ڤێ هەلبەستا جگەرخوین ببهیزن

ژ بونا هەر کەسەك یارەك هەیە ئێ من وەلات یارە
بەلێ چ بکم ددەستێ دژمنێ خوین خوار و غەدارە
چقاس پەسنێ گران بێژم نکارم ئەز بدم زانین
چەلەنگ و نازك و شەنگ و شەپال و شوّخ و جەبارە
هەزار وەك من د ڤێ رێدە بڤان دەرد و کولان کوشتن
تلسما سەر دەڤێ گەنجا دسینگا مندە رەش مارە
چ زانی قیمەتێ ڤێ شەنگە شوّخێ دژمنێ بێ بەخت
نەوەك من دل ب توّپ و ئاورێ یارێ بریندارە
ئەگەر چەندان بدەست دژمن بەلێ یارا منە شرین
ب ناڤێ وێ بلند بومە گهام گەردونێ سەیارە
ب وان لێڤێن شەکەر بارین بمن دا سوّز و پەیمانەك
ژ من پێڤە کو دل نادی کو دل نادی کەسێ ئەو یارە بێ چارە
ئەڤە سوّزا م ژی ژێرا کو دل هەردەم بدم دەستا
نەترسم ئەز ژ زندان و ژ لێدان و بەن و دارە
لە سەر هەر کاڤلی روّنم بکم ڤێرین هەتا هەر کەس
ژ تەمارا خەوێ رابن ببن هوّزان و هشیارە
دبن لنگێ خوەدە دەینن سەرێ دژمن وەکی دوّپشك
ل بەر پوّزێ خوە دەینن وێ گولا نوو بشکڤی خارە
دگوّڤەندا مە دە هەرکەس ب دل شادی بکن دیلان
ل شوّنا هێسرێن چاڤان خوشێن بێن جوّ و جوّبارە
ئەڤە سوّزا من و دلبەر ئەگەر بمرم د ڤێ رێ دە
ژ ڤێ دنیا خوەش و شیرین جگەرخوین ژێ نە بێ پارە

* * *

## جگەرخوین و قەدری جان و شعرا سەربەست

ژ سالا ١٩٣٧ ـ ١٩٤١ قەدری جان ب چالاکی شعرێن خوە و ئێن شاعرێن کورد ب ئەشکرا ژبۆ فەقیێن مزگەفتان دشاند ، و ب نیف نهێنی ـ ژ دزیڤە ـ ل نێڤ شاگردێن کورد ژی بەلاڤ دکر .. سالەکێ ژ وان سالان قەدری جان بوبو سەیدایێ هیکەها سەرەتاییا «ئێندیواری» ، مەلا ئەحمەدێ زڤنگی خودانێ «شەرحا دیوانا جزیری» ئەو ژی مەلایێ مزگەفتا وێ بو ، و مەلا عەبدوسەلام ناجی ژی هەر دیسا ل وێ مزگەفتێ دەرس ددا .. ل سالا ١٩٣٨ قەدری جان تبابەك شعر ژبو وان فەقیێن کو ل وێ مزگەفتێ دخوندن شاندبو .. وەك نها تێتە بیرا من ، رۆژەکێ فەقییەك هات گۆتێ : «تو خودێ قەدری ئەفەندی ئەو چبو ؟ چ نفیس بو ؟ تە دگەل شعرا جگەرخوین و ئەحمەد نامی ژ مەرە شاندی ؟..»

قەدری گۆتێ : «ئەو ژی شعرە ، شعرا نوویە ، ئا منە ، ئەز ولۆ ژی شعرێ دنفیسم ، ما چاوایە ؟. تو چاوا دبینی فەقیێ دەلال ؟» فەقی گۆتێ: «پا چما تە ناڤێ خوە لسەر نەنفیسیبو ؟ ئان تەژی باوەری پێ نینە ؟. خودێ وەکیلێ تەبت سەیدا ، ئێکی دگۆ ئەڤ شعرا زاروکانە ، ئێك دن دگۆ ئەڤە ژنوو ئەم شعرا بێ لێڤ و دفن دبینن ، ئێکی دگۆ پیش کرنا شعرێیە ، هنا ژی دگۆتن مخابنا وێ کاغەزوکا لسەر هاتی نفیساندن ، هەبون ژی دگۆتن ئەو دەست بشکێ ئێ کو نفیسی ، تەنێ دو کەسان دگۆتن : «یاراست ب گۆتنێن خوە خوەشن ، لێ خوەزی شعر بویا !!». قەدری جانێ رەحمەتی خوە کەناند وگۆتێ : «کورۆ بابۆ سترانێن مە ژی ولۆنن . ما سترانێن مە چاوانن ؟ ، خوە شاش مەکن ، پا چما هەیا نها کەسەك دن ئەڤ نەدایە رویێ من ؟..

## ژدەڤێ جگەرخوین

● ل سالا ١٩٧٢ ، ئەحمەدێ جزیری ل بەغدا ئەز دیتم گۆت : «گەر تو دخوازی جگەرخوین ببینی وەرە .. چوم ول گازینویەکێ ڤەدەر و بەراڤ کەیفا خوە بۆ من ئانی .. من ژێ پرسی :

«قەدری جان د دیوانا تە ئا یەکەمدە گۆتیە : «شاعرێ شەعبی ... شاعرێ مە ئێ شەعبی» تو چ دبێژی ؟.. گۆت : «ئەو هزرا تو دکی ، دسەرێ قەدری جانێ جامێردە نینە ، وی بڤێ

گۆتنا خوه دلێ من خوەش کریە ، سەرێ من مەزن کریە ، وی گۆتیە یانی جگەرخوین شاعرێ ملەتە ـ ملیە ـ تەڤاییە ـ گشتییە ـ نیشتیمانییە . کو براستی ژی ئەز خوە وەسا دبینم لاوێن مە ژی ڤێ دبێژن .. ون ڤێ پەیڤێ نە دجهێ وێدە ددنە کار . عەرەب ژی ـ هەروەکی کو من ژوان بهیستی ـ نە دجهێ وێدە ژبو کەلەپۆر «تراث» بکار تینن و کرینە بەرامبەری پەیڤەکا ئەوروپی .. لێ ژبو کو تو باش تێبگەهی لازمە بێژم : ل جەم من جزیری ژ خانی شاعرترە ، و شرینترە ژی ، لێ خانی شاعرێ ملەتێ خوەیە ـ ملیە گشتییە ، «جەڤا کێشتێ عامێیە» عامێ ـ یانی خەلکێ ـ خەلك ملەتە ـ خانی وەلاتییە ـ ملەتییە .. لێ‌ڤا سولتانێ شعر و شاعران ، مەلایێ جزیری نەوەك وی نشتیمانی و ملیە .. نمونەك دن ژ ڤێ بەغدایێ : رەساڤ شاعرێ ملەتە ـ ملیە ـ شەعبییە . لێ ئەز نەشم ڤێ گۆتنێ بدم زەهاوی .. لێ چما تە بەری نهو ئەڤ پرسی نەدکر ؟»

من گۆتێ : «ژنوو ئیسال ل مالا س . ئامێدی من دیوان خوند و هز مەکە ژی کو من باوەر کرە و ئەز پەشیمانم ژی ، لمن مەکرە .. سەیدا گۆت : «قەت پەشیمان نەبە ، تە قەنج کر ، چکو ڤێ پرسێ پێوەندی بزمانێ نڤیساندنێ ڤە هەیە . ئەم ژبۆ ملەت دنڤیسن . ئا قەنج ئەوە ملەت تێبگهی ، ئەگەرنا ژبۆ چیە و چما و ژبۆکێ ئەم خوە دوەستینن ؟»

هەروەها ئامانجا مە نەرم کرنا زمانێ نڤیساندنێیە . ژ ئالیەکی دنڤە گەرەکە ون بزانن کو مەیدانەکێ بابەت و ئاوایێ خوە هەیە .. چاوا کو بابەتێ سیاسی ، شورەشی ، جڤاکی ، زانستی ، ئەڤینی ، تاد .. هەر یەکێ تا رادەیەکێ پەیڤ و ناڤێن خوە ـ ناڤەرۆك و ئاوایێ خوە ئێ تایبەتی هەیە ، هوسا هەر چینەکێ : جوتیار ، پالە ، ژن ، لاو ، زارۆ .. تاد .. هەروەها هەر رەوشەنبیرەکێ ، هونەرمەندەکی ، نڤیسارەکی ئاوایێ خوە هەیە .. نەرم .. هشك .. شێلۆ ، زەلال ، چ وەختێ سەیدا و روناکبیرێن ئاشق خوندن و هشیار لجەم وە پەیدا ببن ، هنگێ نەتەنێ ئەز ، لێ بردەهان ئێن مینا من و ژمن جگەرخوین تر نامینن دبن ڤێ پەردا تاریدە . مخابن دترسم دەمەك بێت ، ون هانا خوە بگەهینن ژێدەرێن بیانی ژبو زانینا تشتەکی دەربارا من ، ئان کەسەك دن ... ژ کنارێ زمان و رێزمانێ ڤە ژی ، تشتێ من زانی و ژمن هات ، من گۆت و نڤیسی ، ئەگەر ون هزر و بیرا خوە هوور تێدە بکن و باش ڤەکەوێشن ، دێ

ببینن کو مه تبابەك نمونه و گوٚتنێن راست و بەرکەتی دبوارا زمان و ریٚزمانا کوردی‌دە گوتینه .. هەر چ‌بن و چاوابن ژی ، دیسان ل‌گوٚر رەوش و پەرگالا مە و رەوشەنبیری‌یا مە یا ئەڤروٚ چاکن ، بەلگە ژی پرن ، لێ گەرەکە ون ب‌هشیاری سودێ ژێ وەرگرن ، ژبەرکو مە ژی چەوت و کێماسیێن خوە هەنە ، تمام کرنا کێماسیان و داگرتنا ڤالەهیان و راستکرنا چەوتان ئەرکێ سەیدایێن ڤی جیلی و جیلێ پشتی مەیە ، کوگەرەکە ژمە زیرەك تر بن .. ئەز ب‌کوردی دبێژم ، ب‌کوردی دنڤیسم و ب‌کوردی دخەبتم مە گەلەك پەیڤێن خوەش و هێژا تێکل نڤیسارێن خوە کرینه ، دا جیێ خوە بگرن ، هەمی ژی هەر دیسان دزمانێ مە دە هەنە ، لێ هنەك وندا بونە و هنەك ژی بەرب وندابونێ دچن .. گەرەکە زمانێ نڤیسینا مە سڤك و سانا و بێ گرێ بت ، هەکەنا دێ هشك‌و گران ببت و بەرە بەرە ئەمێ سڤکی و خوەشی و نەرمیا وی وندا بکن .

ئەڤ کرن و گوٚتنێن جگەرخوین راستن ، گەلەك د جیێ خوەدەنە کو لەسەر گەلەك رێ و رێچکان چوٚیە . وی چاك زانی‌یە کو هەر مەیدانی‌کێ ـ هەر چینەکێ ـ تا رادەیەکێ زمان و ئاویێ خوە ئێ تایبەتی هەیە .. جگەرخوین کوٚچەر بو ، دیمانی بو ، باژاری بو ، هیڤانەك مەزن بو ، رێچەناسەك تەڤایی بو ، ب‌ئاوایەکی بێ گرێ بەرهەم پێشکێش دکر : (ڤایە رێ وەر بدە سەر) . رێیا روٚمەتێ ، رێیا پەرچڤاندنا ستەما کو سەر و پشت ل‌تە شکاندینه و چەماندینه .

جگەر رخوینێ کورد د دیوانا یەکەم دەگەلەك گازن هەناندینه و ئاراستەیێ سەرەکێن ! کوردان کری‌نه ، هێژاتی‌یا وی و یا شێواز و هاناندنا وی ژێ دیاردبن .

ژ پاشا و بەگ و گەردان د ڤێ رێ یەك نەبوو هشیار
ژبوٚ سەربەستی‌یا کوردان ژ وان قەت یەك نەبوو خەفحوار
هەمی تالانکەر و مێرکوژ ، ل‌سەر وان دژمنێ خوین رێژ
مەلان ئێریش برن عەمروٚ ، هەتا زەیدوٚ کرن سەردار
درست بوو کوشتنا کوردان ، دشعرا شێخ و ماموستان
بەگ و ئاغاب ب دەهـ گوندان دگوٚتن هەر ئەمن خونکار

هەتا دبێژت ...
ئەدیب و شاعرێن کوردان ، ب بسکێن شێ مژوول مابوون
یەکی وەك من هەبوونا ، لێ دناڤ وان‌دە دما بێ چار
زەمان سەد فورسەتێن هێژا ، بەلاش دان کەس نەبوو بێژە
هەتا حاسل گها مۆسل جگەرخوین نوو دکی هلوار

* * *

## بەرهەمێ جگەرخوین

جگەرخوین گەلەك نڤیسی و کێمەك ژێ هات چاپکرن . یانی پشکا چاپ نەکری گەلەك ژ ئا چاپکری بێترە ، هەلبەت ئەم ڤێ گۆتنێ نە ژ جەم خوە دبێژن . چکۆل سالا ١٩٧٩ ژنا وی هات بەغدا ژبۆ وەرگرتنا دراڤێ کتێبێن وی ، مە ژێ پرسی گۆت : «ما ئەز رەبەنا خوەدێ ژکۆ زانم . ژ رۆژا کو ئەز و ئەو بوونە قسمەتێ هەڤ ، تا ب ئیلاۆ چەند ل مال بوویە ژ ئێڤارا خوەدێ هەیا دەرەنگی شەڤێ ، گەلەجا ژی هەیا بانگا سپێدێ چەقڤەقا مەکینێ و خشخشا کاغەزان بوویە ، ل مالێن خەلکێ ژی ولۆ بوو ... نیڤ تەلیسەك شاندی‌یە ئان بخوەرە بریە ئەورووپا و نیڤ تەلیسەك لجەم مە ژی مایە ، ژبل ئێ کو دکون و قولێرێن دارو دیوارێن خەلکێ ناس و نەناس‌دە رزینە ئان مشك دخون و درزن».

ئەڤ گۆتنا ژنا وی گەلەك راستە ، چکو هەما ئێ کو من ئاگەهی ژێ‌یە «تاریخا کورد» ، و شەش جلدن ، جلدێ شەشێ ب دەستێ خوە دانەیەك دابوو من ، یەك دابوو ماموستا هەژارێ موکرانی و یەك ژی دابوو مەمێ مەمان . لێ پشتی هنگێ بدو سالان و لسەر داخوازا وی ، من ئەو دانەیا خوە ژێرە شاند .

نهو حەزدکم ناڤێن دیوان و نفشتێن وی ئێن چاپکری بخوینم ، چکو ئەگەرچی ل کوردستانا عراقێ هەنە ، لێ من نەباوەرە ژبل رەحمەتی سەیدا سادق کەسەك دن هەمی کتێبێن جگەرخوین ل جەم هەبن . ئەوکی یە ژمە چارێکا وان هەبێ ؟ . هەما دێ خوە بێژم ، باوەر بکن تا ڤێکا ڤێ ژی ئێك تەنێ ل جەم من نینە و دشێیم بێژم دکتێبخانێن تایبەتی و ئێن دەولەتێدە ژی ژ ٣ ـ ٤ ـ ٥ کتێبێن وی زێدەتر نینە ، لێ هەلبەت ژبل «ئاوا و دەستورا زمانێ کوردی و هەردو فەرهەنگا ( ـ ١ ـ ٢ ـ )

ئێن هەتا نهو هاتین چاپکرن و هەمی ژی نە د چاخێ خوەدە ئەڤەنن :

١ ـ پریسك و پێتی دیوانا یەکەم ١٩٤٥
٢ ـ جیم و گولپەری چیروك ١٩٤٧
٣ ـ سەورا ئازادی دیوانا دووەم ١٩٥٤
٤ ـ رەشویێ داری چیروك ١٩٥٦
٥ ـ گوتنێ پێشیا ١٩٥٨
٦ ـ ئاوا و دەستوورا زمانێ کوردی ١٩٦١
٧ ـ فەرهەنگا کوردی ١ ـ ٢ شارمة ١٩٦٢
٨ ـ کیمە ئەز دیوانا سیبەم ١٩٧٣
٩ ـ میدیا و سالار ١٩٧٣
١٠ ـ روناك دیوانا چارەم ١٩٨٠
١١ ـ زەند ئاڤێستا دیوانا پێنجەم ١٩٨١
١٢ ـ شەفاق دیوانا شەشەم ١٩٨٢
١٣ ـ هیڤی ١٩٨٣

هەلبەت ئێن ژێر چاپ ژی هەنە مادەم ئەم دزانن کو وی گەلەك ئێن ئامادە و بەردەست هەبوون ، لێ راستی یا ڤێ گوتنا مە ، زوو پەردا گومان وتەخمینێ زوو ژ سەر رابت .

ل ڤرحەز دكم ل رۆمانا ژ(CiMuGULPERi) ڤەگەرم ، ئەو چیرۆكا كو «تومابوا» د نڤشتا خوە یا ب ناڤێ «دگەل كوردان» دە گۆتی یە (ل سالا ١٩٤٦ جگەرخوین رۆمانەك درێژ بە لاڤكر ، تێدە بوویەرنە پووچ دنێڤبەرا مێر و ژنەكێ باس دكێ ـ ژین و گولپەری ـ ، جگەرخوین شاش بوویە كو ئەو ب رۆمان حسێب كری).

هوسا ب سانایی و ب زمانێ فرەنسی ڤی زانایێ پاریسی ل سەر چیرۆكا شێخموسێ هەساری نڤیسی . و بێ كو نیف نمونە یەكێ ئان بەلگە یەكێ ژ پووچاتی یا چیرۆكێ شانی خوەندەڤانێن خوە بدێ ، ئان ژی هەما ب و پەیڤێن كورت نڤشتا پووچاتی یا وێ دیار بكێ .

دو خەلەتی د گۆتنا ڤی زانایێ هێژادە بەرچاڤن . ئا پێشین ئەڤ رۆمانا (CiM u GULPERi) ل سالا ١٩٤٧ هاتیە بەلاڤكرن ، نە ل سالا ١٩٤٦ هەروەكی وی گۆتی . ئا پاشین ناڤێ مێرك «جیم ٥ ـ جیم نە «ژین» ، لێ دوورە كو چەوتێن چاپێ بن .

ئەڤ گۆتنا «توما بوا» دبوارا رۆمانا «جیم و گولپەری» دە ، گۆتنێن «مەتران لویس شێخو» دبوارا كتێبێن جەبران خەلیل جەبران تینە بیرا مە .. «شێخو» د كتێبا خوە «تاریخ الآداب العربیة» پشكا سێ رووپەل ١٦٣ ـ گۆتی یە (شعرەحسن مع قصائد یلوح منها روح الثورة والتهوّس و الخلاعة) پاشێ ل رووپەلێ ١٦٩ فەرموّیە : (جبران له مطبوعات شتیٰ شانها بآرائه الفاسدة) ئەو كتێبێن كو شێخو دبێژی «شانها بآرائه الفاسدة» یەك یەك نڤیسی ئەڤن : (الأرواح المتمردة ، عرائس المروج ، البدائع ، الطرائف ، المجنون ، العواصف ، الاجنحة المتكسرة ، المواكب والنبي) تشتەك نەهشت !! هەمی كوشت !!

پاشێ ژی وەك نمونە بابەتەك ئانی یە و دبێژی :

(هذه الغاز لاشئ فیها من منظوم رائق ولا منثور شائق هي اقرب الى الهذیان والسخیف منها الى الكلام المعقول)

هەلبەت تا ئەم چیرۆكێ نەخوینن ، ئەم نەشن بزانن كا جگەرخوین شاشە ! ئان تۆمابوا .. ئامانجا مە ژڤێ هەڤبەركنێ نە ئەوە ئەم تشتەكی ژ هێژاتی یا رەحمەتی توما بواكیّم بكن ، نا ... بەلكی ئەوە دا رەوشەنبیر و خوەندەڤانێن مە بزانن كو هیچاتی و پووچاتی یا ڤی بەرهەمێ جگەرخوین ژی وەك هیچاتی و پووچاتی یا وان بەرهەمێن جەبرانن !! ئەم نڤشتا ڤێ گۆتنا تۆما بوا بەرامبەر جگەرخوین دزانن لێ نەگۆتنا وێ نهو چێترە .

## دەرەنگی‌یا چاپکرنا نڤیسارێن جگەرخوین

(... دخوازم د ڤردە گۆتنەکە کورت و تەڤایی بێژم کو هەمی دیوان و رستێن رستەڤان و نڤیسارێن کورد دەرەنگ و نە دچاخێن خوەدە تێنە چاپکرن . ژ لەورا کێم وەش و بێ هێز و هاڤل دمێنن . لێ تەنێ تشتەك هەیە کو رۆمەت و هێز و دۆز و داخوازێن وان دیـوان و نڤیساران دپارێزی ، ئەو ژی ئەڤە کو خەبات و کێفەراتا گەلێ کورد هەروهەر نایێن راوەستان . ژبەر ولۆ ژی ، کەنگی بێنە چاپکرن ، دوز داخوازێن وان وەکە خوە دمینن وگەوشەك و بێ هاڤل نابن ...) .

ئەگەرچیی ئەڤ گۆتنا وی گشتی‌یە ، نە کەساتی‌یە ، یانی نە ژبۆ خوە تەنێ گۆتی‌یە ، لێ زیانا مەزنتر گهاندیە وی و بەرهەمێن وی ، چکو هەروەکی ئەم دزانن رانی‌یا شعرێن دیوانا یەکەم ، ئێن چاخێ مەلاتی‌یا وینن ١٩٢٦ ـ ١٩٣١ و گەلەك ژوان د هەژمارێن کۆڤاران‌دە بەلاڤ دبون نەمازە (هاوار) ، پاشێ ل سالا ١٩٤٥ دیوانا یەکەم ژوان پێکهات .. بەلگەیەك دن شعرا «پەیمانا بەغدا ـ زنجیر ژ گەردەنم شکەست و گەلەك دن ژی ل سالا ١٩٥٨ نڤیسی‌بو ، لێ ل سالا ١٩٧٣ ددیوانا «کیمەئەز» دە چاپکرن یانی پشتی پازدە سالان . لێ گەلەك ژ شعرێن وی پێش چاپکرنێ ل نێڤ مللەت بەلاڤ دبو . ئەو ژی بسایا شرینی و نازکی‌یا پەیڤ و ئاواز و مۆزیکا وان ، و هەم ژی نەمازە چکۆ مللەت دەرد و ژانێن خوە تێدە ددیتن ، لەورا تا نەحەزێن وی ژی ئەڤ شعرێن وی ژبەر دکرن و ژ دل دخوینن و روندکان دبەررا دبارینن . تا کەسێن وەك شێخ محمد عیسایێ ئاڤدار بئاوازێن خوەش ژ خوەرە دخوونن ، ڤایە سەیدایێ هێژا مەلا محمودێ دێرشەوی دگەل وە دڤێ هۆلێ‌دە رونشتی‌یە ، هەتا ئیرۆ ژی تێرا خوە پارچەیێن بژارتە ژ شعرێن جگەرخوین وەك جگەرخوین ژبەرە و جارجار وەك شەکر ژ دەڤێ وی دەر دکەڤن ، نەتەنێ شێخ و مەلا ، بەلکی بەگ و ئاغا ژی وەك رەوشەنبیرێ کورد ، رێنجبەرێ کورد ، شاگردێ کورد حەژ بەرهەمێن جگەرخوین دکن .. دەروێشێ سەعدوێێ بشارێ چەتۆ وەك من و تە ، وەك رەنجبەرەکی کورد دگۆت و ڤێ کاڤێ ژی هەر دبێژی :

**خانی‌یێ ئاغێ مەزن هەردەم دسەر گوندرە بلند**
**لیس و هێلینا دزایە وەك شکەڤتا سێ دەرە**

ئان ژی :

ئاغا بدەهـ گوندێن خوەڤە باوەر دکی کەیخوسرەوە
تالانکەر دز و کەلەش ، وی دایە سەر رێچا گورە
حالێ مە کورمانجا ئەڤە ، ئەم دێ چلۆ سەربەست بژین
هەرچی کو چۆیە گوهـ مەدێ ، سلاف لسفرا حازرە
سەیدایێ راست و رۆنییە ، لەورا جگەرخوین نامدار
زانا دزانن ئەو کییە ئێن .....

## چاوا ژ کوردستانێ چۆ ؟

ئێڤارەکێ هات دەستورا خوە ژمە خوەست و گۆت :

«ژ پێر ڤە دبێژنە من ، هەڤالێن تە دخوازن تو ڤەگەری سوریا» و ئیران ژی رێ نادی من تێرا بچم بێروتێ ، نها ژی نزانم کەنگی و چاوا ئەزێ هەرم». پشتی هنگێ بدو رۆژان هاتەڤە ، ئەز ڤەویتی کرم کو ئەگەر ب رێ ڤە مر ، تەرمێ وی ل گوندێ «ڤەشەفرێ» ێ ، ڤەشێرن .. ئەڤ گۆت و بوێ پیریتییا خوەڤە رێیا بادینان گرت و کوداند . هەر جگەرخوین دزانێ جگەرخوین چاوا و ب چ رەزالەتێ چۆ سوریا .. رژیما سوری وەك هەر جار دیسا تەنگاڤ کر ... کوردە و کورد لسەر ئاخا خوە ژی بیانییە «ئان هلگرە سەڤییا ریخێ هەر و هەر ، ئان بقەشتە ژڤی گوندی هەرە دەر ناچار کرن چۆ وی سەرێ جیهانێ و گۆت :

ئەڤینا من وەکی هەسپێ چەلەنکە
رەڤاندم ئەز ، نە زەنگۆ و نە هەڤسار

لکۆ دمرم ، دچم کۆ ؟ ئەز نزانم
دەما دمرم ، ئەزێ چ بکم ب هەسار

ب بەر پێلا کەتم بێ دۆز و داخواز
دنالم ئەز وەکی هرچێ بریندار

جگەرخوین بەس ببێژە ، پر درێژە
بەسە کوردۆ ژخەو رابە تو هشیار

هەلبەت راست کو هشیارێ نفستی ژی هەیە ، لەورا گۆتی‌یە بەسە کوردۆ ژ خەو رابـە توهشیار .
مە زانی کا چاوا جگەرخوینێ پیر و تادار بێ هەمدێ خوە ژ بەغدا چۆ ، و مە زانی ل سوریا ژی چ بسەرێ وی هات و پاشێ ژی چاوا هات خوە دا بـەر سیها وێ شـەنگەدارا مـە یا کـورما خلخلاندی و ستەما رشا جیهانی رزاندی ، و خوە کر هەڤال و خولامێ دۆزا مە یا پر ئەرد و ئێش ، مە ژی جارەك دن بەرێ وی دا رژیما سوری و پاشێ ناچار رۆژهلات ب جارەك پاش خوەڤە هشت ، ئەو رۆژهلاتا کو جگەرخوین وەك وەلاتێ خوە حەژێ دکر و ب ناڤێ وێ دخـورِی ..

جگەرخوین تێرا گۆرێ خوە ئەرد د وەلاتێ خوەدە نەبوو ، بگرە ئەو « ١٥٠ » مترێن قادێ ئێ کو خانیکێ خوە ئێ . بچوك لسەر ئاڤاکری ، جامێرەکێ فلە ب دیاری دابوویێ .. ئەڤ هـەمی نەبەس بوو ، هنەك زرِکورد ل ئوروپا لێ پەیدابوون و شەرِێ وی کرن ، چ‌یە ـ نە چ‌یە ، ئێکی گۆت هار بوویە ، ئێ دن گۆت دین بوویە ، و هنا ژی دگۆ لاونۆ‌ها ژێ هەبن بڤڤەیە دێ ئەوروپا مە یا دیموکراسی بکی مارکسی ، هنا ژی دگۆ کریڤێ هافز ئەسەدە ، باوەر بکن هەبوون ژی دگۆتن شعرەك چل و چار متری دژێ خومێنی نفیسی‌یە ، وەی ماشەللا و سەد ئافەرین بۆ دوندەیا خوەخوەر و خوە نەناس و رەڤرەڤۆك ... گەرەکە ناحەزێن جگەرخوین بزانن کو جگەرخوین بوویە رەمزەك ژ رەمزێن مللەتێ خوە ، سەیدایەك ژ سەیدائێن خەبات و کێفەراتا رەنجبەر و رەوشەنبیرێن کورد .. مە نەگۆتی‌یە و ئەم نابێژین وەرن ل پەی دیتانی‌یا وی یا فەلسەفی هەرن ، ئان ژی دگەل رێبازا وی یا سیاسی بن .. لێ تو کوردبی و دژمنێ جگەرخوین ژی بی ، زەحمەتە کەکۆ مێژوڤانێ چەلەنگ عبد الرقیب یوسف دبێژی : چاخێ ئەز بچووك ، لشۆنا بگۆتان فلان

کەس کوردە ، دگۆتن جگەرخوونە» ... بلا ئەم ژی وەك شێخ خالدێ نەقشبەندی و دکتور سەدیق ئەتروشی و سادقێ ئامێدی ل کەساتی و مرۆڤاتی‌یا جگەرخوین تەماشاکن . سادق کوردەکی پاڤژ و مسلمانەك باشبوو مسلمانەك راست و ژ دل و کەسەکی ژمە تەمەتی وی تێکلیا

جگەرخوین و هەڤالتی‌یا جگەرخوین نەکرو تەمەتی وی دیوان و نڤشتێن وی ژی نەدیتینە . قەت رۆژەکێ ژ رۆژان وی ناڤێ جگەرخوین بخرابی نەبر و گازنەك ژێ نەکر .. دکتور سەدیق

ئەترۆشی دگۆ جگەرخوین یانی دیوانا کوردی .. سەیدا رەمەزانێ ئەچار زاخویی ل کۆنگرا هیکارێن کورد ل شەقلاوە دیتی‌یە ، تا ڤێ گاڤێ ژی هەر دبێژی : مروڤ ژ جڤاتا جگەرخوین و تێکهێژتنا وی تێر نەبوو .

## جگەرخوین د رۆژنامە و کوڤارێن عراقی دە

ژ مێژڤە و بەری مرنا وی ، رەوشەنبیرێن کوردستانا عراقێ حەزدکرن لسەر بەرهەم و چالاکی‌یێن جگەرخوین باخڤن و بەلاڤ بکن و شروڤە بکن و کەساتی‌یا وی نیشا مللەت بدن ، لێ مخابن دەستور نەبوو . لێ وەسا ژی نەمازە دمەیدانا زمان و رێزمانێ دە ناڤێ وی د کوڤاران دە

جار جار دهات و ژ رادیووا بەغدا یا کوردی دهات بهیستن .. لێ پشتی بهیستنا سالوخا مرنا وی جوانێن رەوشەنبیر تیابەك شعر و گۆتار بکوردی و عەرەبی پێشکێشی جانێ جگەرخوین کرن ،

ئەگەرچی هندەك ژێ لاواز و نەتمام بوون لێ تشتنە بەرکەتی تێدە هەبوون . لێ مخابن پرانی‌یا وان بابەتان روناهی نەدیت . هەر چبە و چاوابە «هاوکاری» و «کاروان» و رووپەلێ «رەوشەنبیری‌یا کوردی» ل رۆژناما «العراق» دەنگ ژێ ئانین .. لڤر گەرەکە ئەم ژ هەڤ و ژ

خوە ژی بپرسن : گەلۆ چما و ژبەر چ ئەو سالوخا کو رۆژناما «الثورة» زمانێ پارتا بەعسا عەرەبی‌یا هەڤپشکی د رووپەلێ خوە ئێ پاشین دە ـ هەژمار ٥٣٢٣ ل ٣/١٠/١٩٨٤ دبوارا چلەیا وی دە بەلاڤکری نەهات کرن ؟! ..

ئەڤە دەقێ وێ سالوخێ‌یە ، ئەم دێ ب عەرەبی پێشکێشی بکن .

## حلقة دراسية عن الشاعر جگەرخوين

سيقيم اتحاد الادباء والكتاب في القطر العراقي ـ فرع اتحاد الادباء والكتاب الاكراد حلقة دراسية عن الشاعر الكردي الراحل جگەرخوين تتناول ادبه وحياته .. وستقام الحلقة على قاعة الاتحاد في اربيل لمناسبة اربعينية الشاعر .

لێ مخابن ئەو رۆژا دیارنەکری هات و بێ دەنگ و رەنگ و ئاهەنگ بۆری چۆ ، «نه لمنێ و نه لتەیێ» ئەلبەت پرس و کازند ژ لڤێ یەکیتی‌یا تورڤان و نڤیسڤانێن کورد ل هەولێر تێنه کرن . چکۆ جهێ کرنێ دیارکرنه ، لێ رۆژا وێ دیار نەکرنه . ژ ئالی‌یەکی دن ڤه ژی ، هەر هنگێ ، یانی رۆژا بەلاڤکرنا سالوخێ ۱۲ رۆژ سەر چلا وی‌ره دەرباز ببوون ، لێ خەم نەدکر گەر بهاتا کرن . نەژبەر نەکرنێ ڤێ دبێژم ، لێ ژبەر دیارنەکرنا ئوشتا نەکرنێ ... چما نەهات کرن ؟.

ئێدی هیڤیدارم کو سەیدا و خەم هلگرێن تەڤگەرا رەوشەنبیری‌یا مە یا ئەڤرۆ ئایندە سوودەک چاك ژ بەرهەمێن «جگەرخوین» ێ زمان ساخ و تم نووژەن وەرگرن و ڤی جیلێ مه ئی نهو پێ وەرار بکن و کاروانێ رەوشەنبیری‌یا کوردی ب گشتی ل سەر رێچەك راست و درست بەر ب ئامانجا براتی و مرۆڤاتی‌یێ ڤه بازۆن .

سلاڤێن مه و رەحمەتا خودێ ل جانێ جگەرخوین و ئاڤەرین بۆ هەر کەسێ وەك وی ژینا خوە د رێ‌یا دلبەرا خوەدە مەزخاندی و سۆزا خوە نەشکاندی .

ئەڤە سۆزا من و دلبەر ئەگەر بمرم د ڤێ رێ دە
ژ ڤێ دنیا خوەش و شیرین جگەرخوین ژێ نەبێ بارە

(۱) کۆڤارا (ژین ـ jiin) توژاندنا سەیدا محمد امین بوزارسلان

* * *

# کۆنگرەی یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد

ئامادەکردنی ع . سەرسام

**پاش چەندیی رۆژ لەخۆ ئامادەکردن و ماندووبوون لەلایەن ئەندامانی یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لە شاری هەولێرو شارەکانی تری کوردستان ، دەستە دەستە قەڵەم هەڵگرو رۆشنبیرانی کورد گەیشتنە شارە دێرینەکەی هەولێر ، ئەوە بوو لە رۆژانی ٢٢ ـ ٢٣ / ١٠/ ١٩٨٦ یەکەمین کۆنگرەی یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لقی یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی عیراق لە شاری هەولێرا بەم جۆرەی خوارەوە سازکرا :ـ**

سەر لە بەیانییکی رووگەش و خۆش ، هۆڵی رۆشنبیری جەماوەر گرمەی دەهات ، زۆربەی میوانەکان لەدوورەوە هاتبوون بەلام وەك خاوەن ماڵ رەفتاریان لەگەڵ یەکترا ئەکرد . کۆنگرە بە وتاری بەڕێز محمد حمزە ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش کرایەوە .

دوا بەدوای ئەو بەڕێز

د . نافع ئاکرەیی سەرۆکی لقی کوردستان وتارێکی خوێندەوە تیایدا باسی چۆنیەتی دامەزراندن و گیروگرفتی ئەم یەکێتییەی کرد . ئینجا بەڕێز عبد الأمیر معلە سەرۆکی یەکیتی ئەدیب و نووسەرانی عیراق ، وتاری مەڵبەندی خوێندەوە . دوابەدوای ئەمە ئەندامانی لقی کوردستان بەڕێزان . د . نافع ئاکرەیی ، محمد بدری ، حسین جاف . مامۆستا محمود زامدار ڕاپۆرتی رۆشنبیری خوێندەوە ئینجا کاك صلاح شوان ڕاپۆرتی دارایی خوێندەوە ، هەروەها مامۆستا محمد بەدری نامەی بەڕێز د . احسان فؤادو عبد اللطیف بندراوغلوی خوێندەوە کە ئاڕاستەی کۆنگرە کرابوون .

دوابەدوای خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکان بەڕێزان : مصطفی نەریمان ، دلشاد مەریوانی ، ئومێد ئاشنا ، سگڤان عبدالحکیم . خالدحسین ،اسعد عدۆ . محمد امین پنجوینی ، شهاب عثمان ، اسماعیل ڕۆربەیانی، ئازاد عبدالواحد گفتوگۆیان لەسەر ڕاپۆرتەکان کرد ، وە لەلایەن ئەندامانی لقی کوردستانەوە وەلامیان درایەوە .

لە ئێوارەی هەمان ڕۆژا دەستەی سەرپەرشتکاری کونگرە لەم بەڕێزانە پێکهات . کریم زەند ، تیلی ئەمین ، مولود قادر .

دوابەدوای ئەم گیروگرفتی لقی هەولێر باسکراو بۆ ئەم مەبەستەش مامۆستایان : سعیدیحیی ، عبدالامیر معله عبدالکریم فندی ، صلاح شوان ، عبدالخالق سەرسام ، دلشاد مەریوانی محمد بەدری ، نصرالدین مجید ، گفتوگۆیەکی دوورد درێژیان کرد لە ئەنجامدا بریاردرا لە ڕۆژی ٢٣ / ١٠ / ١٩٨٦ لقی هەولێر ئەندامانی دەستەی بەڕیوەبەری سەر بەلقەکەی خوی هەلبژێرێ .

لە پاشانا بڕیاردار ئەم لێژنانە پێکبێت

**(١) لێژنەی بڕیارو پێشنیار لەم بەڕێزانە پێکهات**

**کاك سعید یحیی.**

**کاك عبدالکریم فندی .**

**کاك صلاح شوان .**

**کاك خالد حسین .**

**(٢) لیژنەی گۆفاری نووسەری کورد**

**کاك محمد بەدری.**

**کاك محمود زاامدار .**

**کاك فؤاد حمەخورشید .**

**کاك ئازاد عبدالواحد .**

**کاك رمضان عیسی .**

**کاك عبدالخالق سەرسام .**

کاك عزیز حەریری .
کاك غفور صالح .
کاك جمال شاربازێری .
کاك اسماعیل ڕۆژبەیانی .
بەشداریان کرد .

(٣) لێژنەی بەرگری لە مافی ئەندامان لەم بەڕێزانە پێکهات
کاك حسین جاف .
کاك نصرالدین مجید .
کاك محمد مولود .
کاك وصفی حسن .
کاك محسن قۆچان .
کاك حجی جعفر .

(٤) لێژنەی لێکۆلینەوە لە ئەندامان
کاك مختار فائق .
کاك تیلی ئەمین .
کاك کریم زەند .
کاك مولود قادر .
... بەشداریان کرد .

(٥) لیژنەی موتابەعەش لەم بەڕێزانە پێکهات
کاك عبدالله جندی .
کاك حسین بەرزنجی .
کاك سکفان عبدالحکیم .

سەرلەبەیانی ڕۆژی دووەمی کۆنگرە لێژنەکان ڕاپۆرتی خۆیـان خوێنـدەوە ، پاش گفتوگۆییکی زۆر بڕیار لەسەر پێشنیارەکان درا ، دووابەدوای ئەمە دەگای هەلبژاردن کرایەوە ئەم بەڕێزانە خۆیان هەلبژاردو ئەو دەنگانەی خوارەوەیان وەگرت .

د . نافع ئاكرەیی (٧٠) دەنگ ، صلاح شوان (٧٠) عبد الكريم فندی (٥٤) محمد بەدری (٥٢) ، سعيد يحى (٤٧) سگڤان عبد الحكيم (٣٩) دلشاد مريوانی (٣٢) ئەم بەرێزانەی سەرەوە دەستــەی لقی تازەی یــەکێتی ئەدیبو نــووسەرانی کــورد لقی کوردستان پێکهێنا هەروەها ئەم بەرێزانەش بوون بە ئەندامی ئیحتیات محمد امــین پنجوینی (٣١) محمود زامدار (٣١)

دووابەدوای ئەمە بەیانی کۆتاییو بروسکەیێك بۆ سەرۆکی فەرماندە میهب روکن صدام حسین خوابیپارێزی خوێندرایەوە . لە دوای کۆتایی کۆنگرەی یەکەم دەستکرا بە هەلبژاردنی لقی هەولێر کە ئەم

بەرێزانە بوون بە دەستەی بەڕێوەبەری لقەکە

| | |
|---|---|
| کاك عبد الخالق سەرسام . | (١٥) دەنك |
| کاك شیرزاد عبد الرحمن . | (١٤) دەنگ |
| کاك احمد تاقانە . | (١٤) دەنگ |
| کاك مغد يد سۆران . | (١٢) دەنگ |
| کاك فريد زامدار . | (١٢) دەنگ |

ئەم بەرێزانەش بوون بە ئەندامی ئیحتات .
(١) ئەسعەد عەدۆ (١١) دەنگ
(٢) پیربال محمود (١٠) دەنگ
بەمجۆرە کۆتایی بە هەلبژاردنی لقی کوردستانو لقی هەولێر هات .

# عەشقا مەیا بی تو خییە

● بهجت محمد هروری ●

چ گلینە !

چ گازندن !

وەی خانم

هندەك جارا من دڤێت بکەنم !

دەستور دبێژێت :

کەنی نابیت

جارژی هەنە من دڤێت بگریم !

دەستور دبێت :

گریژی نابیت

ل ڤێرە عشق یا هوسایە . .

ژین هوسایە . .

هاتن و چون یا هوسایە . .

هەمی دەستور و یاسایە

نەشێم لناڤ رێك و کولانا

دلداری یێ دگەل تە بکەم

ئێش و برینا تە هایدەم . .

ئو دیارکەم

کولان داڤن . .

دێ مه گرن
کولان نه‌دراستن ، که‌ندن
کولان خه‌فکن
. . . بونه زڤروك
ته‌ڵه‌و ته‌پکن
. . . دێ مه گرن
کولان . . کولان . . هه‌می کێلان
جهێن جڤات و ژڤانێن مه نه‌هێلان
ل شوێنێ کرنه ته‌پك
داڤ لێ ڤه‌دان . .
هوسا که‌ربا ژ عه‌شقا مه هه‌ی
لێ ئه‌ڤروکه . .
عه‌شقا مه‌ژی . .
ڕهێن خو کویر . . دویر داهێلان
چو ده‌ستورو یاسا نه‌شێن
. . . توخیبه‌کی
ل‌دورا دانن سه‌راسه‌ر
دلێ من . . هه‌ی خاتما من
مالکا ته‌یه‌و تو یاتێدا
چو ده‌ستورو یاسا نه‌شێن
عه‌شقا ژێ بکێشنه ده‌ر
ئێکه‌دی دارێژنه سه‌ر ، لێ بچینن
نه‌شێن ستێرا ژئاسمانی که‌ن
تێروژکا ژ ڕوژێ ڤه‌که‌ن
عه‌شقا مه سیبه‌را مه‌یه . . .
نه‌شێن ژمه بکه‌ن
نه‌شێن . . نه‌شێن